# پێڕست

## پێشەکی

فۆلکلۆری کوردی بە گشتی و بەیتی کوردی بەتایبەتی، لە خۆگری سامانێکی چڕوپڕ لەیادەوەری مێژوویی [*] و ئەستی بەکۆمەڵی [**] گەلەکەمانە. بە درێژایی سەدەی رابردوودا، هاوکات لەگەڵ ئاشکرابوونی ئیرادەی خوێندەواران و رووناکبیرانی کورد بۆ خوێندنەوە و تاوتوێکردنی سامانی فیکری گەلەکەیان ـ لە پەند و مەتەڵ و گاڵتە و گەپی خەلکی رەمەکییەوە بگرە هەتا فیکر و فەلسەفەی پیاوانی بلیمەت ـ شاهیدی سەرهەڵدانی زەمینەیەکی تازە بۆ موتالا و لێکۆڵینەوە بووین کە دەکرێ ئەو زەمینە زانستییە،بە «بەیتناسی» ناودێر بکەین.

بەیتناسان، بۆکاری لێکۆڵینەوەی زانستی لە بارەی بەیتدا، جگە لە بەیت بێژان، قەرزداری کۆمەڵێکی دڵسوز و ماندوویەتر بە نێوی بەیتنووسانن. بەیتنووس، ئەو کەسانەن کە دوابەدوای لەکەمی دانی ژمارەی بەیت بێژان، لە بەر رمێنی ئامێرەکانی مۆدێرنی پێوەندی وەک رادیۆ و تەلەفیزیۆن، وشیارانە وەخۆکەوتن و دەستیان‌دایە کۆکردنەوەی دەقی بەیت و ئەو سامانە نەتەوەییەیان لە مەترسی فەوتان پاراست. هەر لەم کتێبەی بەردەستدا، باسی ئەوەمان کردووە کە یەکێك لە سەرەکی‌ترین مەرجەکانی لێکۆڵینەوەی بەیتناسانە، بریتی بووە لە «بەدەقکردنی بەیت»، واتە هەر ئەو ئەرکە کە بەیتنووسان، وەخۆیان گرتووە و بەجێیان‌هێناوە.

---

[*] یادەوەری مێژوویی: حافظة تاریخی

[**] ئەستی بە کۆمەڵ: ناخود آگاه جمعی

گەرچی یەکێك لەگرینگترین لایەنەکانی بەرباسی بەیتی کوردی، لایەنە مێژووییەکەیەتی،بەڵام ناتوانین بڵێین تاقە ڕێگای لێکۆڵینەوە لەسەر بەیت، بریتییە لە خوێندنەوەی مێژوویی و بەراوردکردنی دەقی بەیت لەگەڵ دەقە مێژووییەکانی پشت پێبەستراو.

ئەگەر شێوازی لێکۆڵینەوەی مێژوویی، وەکوو شێوازی«ناوزەمانی» ناو بێنین، دەکرێ بڵێین شێوازێکی گرینگیتر بۆ تەحلیلی بەیت ـ کە بتوانین ناوی شێوازی«هاوزەمانی» لە سەر دابنێین ـ بریتییە لە لێکۆڵینەوەی پێکهاتەخوازانە* .

لەم لێکۆڵینەوەیەدا، جگە لە کەلکەڵەی ناسین و ناساندنی دەقی بەیت، کەلکەڵەیەکی جیدی دیکەم، ڕەچاوکردنی مێتۆدی دروستی شێوە لێکۆڵینەوەی پێکهاتەخوازانە بووە. ئەگەر نەڵێم سەر لە بەری ئەم لێکۆڵینەوەیە، دەتوانم بڵێیم سەدا نەوەدی، لە سەر بناغەی ئەم شێوە توێژینەوەیە دامەزراوە. دیارە لەهێندەك بەشی ئەم نووسینەدا، وەکوو فەسڵی یەك کە باسی مێژووی لێکۆڵینەوەکانی بەیتناسی تێداکراوە، بە گوێرەی سروشتی تایبەتی باسەکە، بە شێوەیەکیتر لێکۆڵینەوەکەم بەرێوە بردووە.

مەسەلەیەکیتر کە لەم نووسینەدا، زۆرم هەوڵ بۆ داوە خۆ پاراستن لە لێك هەڵاواردنی نابەجێی دەقە فۆلکلۆرییەکانی سۆرانی و کرمانجی بووە. زۆر کەس لە بەیتناسان، خۆیان بەم تیۆرییە حەساندۆتەوە کە جیاوازی پێکهاتەی دەقە فۆلکلۆرییەکان، دەگەڕێتەوە بۆجیاوازی زاراوەکانیان. ئەم بۆچوونە، هێندەك جار وەڕاست دەگەڕێ، بەڵام خاڵێکی شیاوی سەرنج لەم زەمینەیەدا ئەوەیە کە بەیت بەهەر دوو زاراوەی کرمانجی ژووروو و کرمانجی ناوەڕاست گوتراوە و دیالێکتی بەیت، هێندەی هیچکام لەم زاراوانە، بەرتەسك نابێتەوە. تەنانەت هێندەك لەم شێوە گوتنانە، کە زۆرکەس پێیان وایەهەر بە تەنیا بەزاراوەی سۆرانی هەن، بە شێوەی کرمانجیش گوتراون. من بۆ خۆم «پایزە»م بە زاراوەی کرمانجی لە ناوچەی شنۆ بیستووە. کەواتە ئەوەندەی پێم کرابێ لە جێگای خۆیدا، لە دەقە کرمانجییەکانیش نموونەم هێناوەتەوە. (هەڵبەت میسداقەکانی وشەی بەیتیش، بە پێی بۆچوونە جیاوازەکان، گۆڕانیان بە سەردادێ. لە سەرەتای فەسڵی یەکەمدا، باسی ئەو جیاوازییانەم کردووە.)

ماوەتەوە بڵێم کە ئەم لێکۆڵینەوەیە، بە درێژایی دوو ساڵان سەری گرت. هیچ بانگەشەیەکم لە بارەی ئەم نووسینەدا نیە. دیارە ئەگەر ڕێی تێبچێ کە هێندەك مەبەستم لەبارەی دەقی

---

* پێکهاتە خوازی: ساختارگرایی

بەیتدا، بەدروستی پێکابێ؛ ئەگەری ئەوەش هەیەکە لە هێندەك بابەتدا، بە هەڵەچووبم. ئەوەندەی پێم کراوە، لەم کارەدا گرینگیم بە وەسواسی زانستی داوە. ئیتر داوەری دوایی دەهێڵمەوە بۆ خوێنەرانی بەرێز، هەر ئەوەندە دەتوانم بڵێم کە لەم زەمینەیەدا، من ئوستادیم نەکردووە، بەڵکوو بەقەدەر حاڵی خۆم، مەشقی ئوستادم کردووە. ئوستادەکەشم، ئاوەزی بە کۆمەڵی گەلەکەم بووە، کە لەبەیت و بەیتناسیدا رەنگی داوەتەوە. مەحوی گوتەنی:

بێستـــــوونی عیشقی شیرینێك ئەوا هاتۆتە پێش
گەر لە حەق بێم و نەیەم، تەقلیدی فەرهادێ دەکەم
دەرسی عیشقم هەر لە کن پەروانــە یا بولبول بووە
بیگەمێ یا نەیگەمێ، هەر مەشقــی ئوستادێ دەکەم

لە کۆتاییدا، ئەو پەڕی سپاس و پێزانینم پێشکەشی بەرێز کاك ئەحمەد قازی دەکەم کە مامۆستایانە ئەم لێکۆڵینەوەیەی خوێندەوە و دڵسۆزانە تێبینییەکانی خۆی دەربڕی. هەروەها پڕ بە دڵ سپاسی هاوالآنی خۆشەویستم بەرێزان عەبدولخالق یەعقووبی، یوونس رەزایی و عەلی قاسمی دەکەم کە سەر لە بەری ئەم نووسینەیان خوێندەوە و بە پێشنیارەکانیان هاوڕێییان کردم. زۆریش سپاسی ناوەندی ئینتشاراتی سەلاحەدین ئەییوبی دەکەم، نازانم ئەگەر ئەو بەرهەمەیان بۆ چاپ نەکردبام، هەتا کەنگێ نەمدەتوانی چاپ و بڵاوی بکەمەوە.
با نالی گوتەنی «تەی کردنی نامە و پەی کردنی خامە» بە بەیتە شێعرێکی مەلای جزیری بێ:

تو ژ فەسلێ وەرە ئەسلێ کودڤێ دەیری خەراب
دا نەبی مەرکە بی جەهلێ تو دبن باری حدووس

رەهبەر مەحموودزادە، شنۆ، زستانی ١٣٨١
٢٠٠٣ زایینی

وشەی «بەیت» لە نووسراوەکان و لە ئاخافتنی خەڵکی ئاساییدا، بە سێ مانای جیاواز دەکارکراوە:

١ـ بە مانای هەرەگشتی: واتە ئەو بەشە لە فۆلکلۆری کوردی کە تێکڕای «ئەدەبی داستانیی زارەکی» دەگرێتەوە. دیارە لەم بەکارهێنانەدا، وشەی بەیت جگە لەلاوك و حەیران و بەند، بەشێك لە گۆرانی و چیرۆکی فۆلکلۆریشی گرتۆتەوە.

هەر ئەو چەشنە لێکدانەوەی مانای وشەی بەیت، بۆتە هۆی قەناعەت هێنان بەمە کە «بەیت» لە ئەدەبی کۆنی گەلانی دیکەش دا هەبووە:

«ئەورووپییەکان، وشەی کۆنی یۆنانی «epic » بۆ شتێکی لە بەیتی کوردییەوە نزیك بە کار دێنن... ئەپیکی ئەورووپییەکان، دوو جۆر بوون:« folk epic» واتە بەیتی رەمەکی کە ئەمەیان بە سەر زاری گەلدا دەگەڕا و دێبەدێ و ناوچە بە ناوچە لە بەر دەکرا و دانەرەکانیان نەناسراو بوون وەکوو «ئیلیاد و ئۆدیسە»ی یۆنانی. جۆری دووهەمی ئەپیك، پێی دەڵێن«art epic» واتە بەیتی هونەری ئەمەیان دانەرەکەی دیارە.»[1]

٢ـ بە مانای تایبەتی: واتە بەشێك لە ئەدەبی زارەکی کوردی کە گەرچی خزمایەتی و نزیکایەتی لەگەڵ لاوك و حەیران هەیە، بەڵام نە لاوکە و نە حەیران. بۆ نموونە «لاس و خەزال» ـ بەم مانا تایبەتە ـ بەیتێکە کە بەم ناوە لەنێو خەڵکدا بەناوبانگە و ناکرێ ناوی لاوك و حەیرانی لە سەر دابنێین.

لەم گوتەیەی خوارەوەدا، وشەی بەیت بەم مانایە دەکار کراوە:

«جیاوازی بەیت لەگەڵ هێندێك گۆرانی میللی کورد وەك حەیران، لەتار و لاوك، ئەوەیە کە بەیت بە زۆری گێڕانەوەی تێدایە و بە گشتی درێژە. بەیت هەروەها زۆر بە روونی لە حیکایەت یان چیرۆکی کوردیش جیایە.»[٢]

٣ـ بە مانای گشتی: واتە چەشنە بەکارهێنانێك کە لە نێوان مانای هەرە گشتی و مانای تایبەتیدا جێگیردەبێ. لەم چەشنە لێك دانەوەیەدا، بەیت بەمانای تایبەتی و هەروەها لاوك و حەیران، هەموویان تێکڕا ناوی بەیت، یان جاری وایە لە بەکارهێنانێکی بەرفراوانتردا ناوی «بەیت و باو» ـ یان لەسەردادەنرێ.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا، بە چەند هۆیەك کە داوتر پتریان لەسەر دەدوێین، مانای سێهەم لە زاراوەی «بەیت و باو» لە بەر چاوە. واتە توێژینەوەکەمان، لەنگەرگرتنێکە لە سەر بابەتەکانی لاوك و حەیران و چۆنیەتی گەڕانەوەیان بۆ ریشەی بەرپلاوی بەیت و هەروەها چۆنیەتی دابەشبوونی ئەو جۆرانە (geners) لە رووی پێکهاتەی تایبەتیانەوە.

تەنانەت ئەگەر تێگەیشتنی گشتی خەڵکی ئاسایی، رێگامان پێنەدا حەیران سەر بە بەیت بزانین یان گەلۆ، سەر بە حەیران بزانین، ئەوا دەبێ لە سەر ئەو خاڵە داکۆکی بکەین کە  ئێمە قسە لە پێکهاتەی (structure) دەقی ئەو جۆرانە دەکەین واتە باسی ئەوە دەکەین گەلۆ، هەر ئەو چوار چێوەیەی هەیە کە حەیران هەیەتی یان حەیران خاوەنی ئەو فۆرمەیە کە پێکهاتەی گشتیتری بەیت، دایدەگرێ و دەیکا بە بەشێکی هاودەنگ و هاوسروشتی خۆی.

کاری کۆکردنەوەی بەیتی کوردی، خاوەنی مێژووی تایبەتی خۆیەتی. وادیارە ئەو کارە لەساڵەکانی ١٩٠٣ و ١٩٠٤ دا بۆ یەکەم جار لە لایەن ئۆسکارمان ـ ی ئاڵمانی لە کوردستانی ئێراندا، دەست پێ کراوە. هەتا ساڵی

١٩٦٠، تاك و تەرا چەند حەولێکی تر بەجیا، بۆ کۆکردنەوەی دەقی بەیتی کوردی دراوە. بۆ وێنە«حاجی جوندی» و «ئەمینێ ئەفدال»، کتێبەکی ٦٦٤ لاپەڕەییان لە یەکێتی سوڤیەت لەچاپ داوە کە داگری هێندێك دەقی فۆلکلۆری بووە. «کوردی و مەریوانی» کتێبێکی ٧٦ لاپەڕەییان بە ناوی «گۆرانی» لە بەغدا بڵاو کردۆتەوە کە لەخۆگری چەند بابەتی فۆلکلۆری بووە.[٣] لە ساڵی ١٩٥٦دا «عوبەیدوڵلا ئەیوبیان»، بۆ یەکەم جار بەیتی خەج و سیامەندی بڵاوکردۆتەوە. لەساڵی ١٩٦٠ بەملاوە، بڵاوکردنەوەی بەیت، ڕەوتێکی خێراتری بەخۆوە گرتووە. قادر فەتاحی قازی حەوت بەیتی بەشێوەی کتێب بڵاو کردۆتەوەکە دوامینیان بەیتی لاس و خەزاڵە کە لە ساڵی ٢٠٠٠دا بڵاو بۆتەوە. شەش بەیتە کەی تر ئەمانەن: سەعید و میر سێوەدین بەگ، مێـــر و وەفـــا، بارام و گوڵەندام، شورمەحموود و مەرزنیگان، شێخی سەنعان و شێخ فەرخ و خاتوون ئەستی.پێشەکی هێندێك لەم کتێبانەی قازی، کورتە بەیتی دیکەشی لەخۆ گرتووە.

لە کوردستانی باشووردا زۆرکەسی وەك: ئەسعەد عەدۆ، ئەحمەد حەیران سەعدوڵلا شێخانی، ڕزگار خۆشناو، خالید جووتیار و محەمەدی مەلاکەریم، کاری ڕێك و پێکیان لەم بارەوە کردووە. لەتوێژەرە بیانییەکان، جگە لە ئۆسکارمان، کەسانێکی وەکوو«م. ڕۆدینکۆ» و «ڕۆژێ لیسکۆ» لە بەشەکانی جیاوازی کوردستاندا فۆلکلۆری کوردییان کۆکردۆتەوە. گۆڤاری «سروە» لە دەسپێکی بڵاو بوونەوەیەوە، کۆمەڵێکی زۆر بایەخداری لە دەقە بەیتییەکان تۆمار کردۆتەوە. هەروەها ماوەیەکە گۆڤارێکیتر بە ناوی« ئاسۆی فولکلۆر»، لەهەولێری کوردستانی باشوور بڵاو دەبێتەوە کە گشت بابەتەکانی، یان دەقی فۆلکلۆرین، یان لێکۆڵینەوە لە سەر فۆلکلۆرن. وەك دیارە، بەرچاوترین کاری تازە سەبارەت بە کۆکردنەوەی بەیت، کتێبی بە وەجی«گەنجی سەربەمۆر»ی

ئەحمەدی بەحرییە.ئەم کتێبە، داگری نەوەد دەقی بەیت و یازدە وتارە. هەروەها فەرهەنگۆکێك و فەرهەنگێکی ناوەکانی نێو بەیتیشی تێدایە. وەك دانەری کتێبەکە، خۆی دەڵێ:

**«ئەم کتێبەی من، بە پێچەوانەی زۆربەی ئەو سەرچاوانەی کە دەستم کەوتوون، لاپەڕەی دەقەکانی لە هی بیر و رای نووسەر زۆرترن»[٤]**

کەواتە تا ئێستا، جگە لە کاری کۆکردنەوە، کاری لێکۆڵینەوەی بەیتی کوردیش بەڕێوەچووە. لەباس و خواسەکانی مەعریفەناسی(epistemology) دا، باسی مەعریفەکانی «پێشینە» و «پاشانە» کراوە. روانگەی پێشینە یان پلە یەك، شێوە ناسینێك بەرهەمدێنێ کە لەناوەوەی سیستمێکی بیریدا، لە بارەی خودی ئەو سیستمە شەقڵ دەگرێ. مەعریفەی پاشانە، یان پلە دوو، شێوەناسینێکە، کە لە دەرەوەی سیستمەکی بیری و بە بەراورد لەگەڵ سیستمەکانی دیکە، پێك دێ. لەبارەی جیهانی مۆدێرندا گوتوویانە، بەرچاوترین جیاوازی جیهانی مۆدێرن لەگەڵ جیهانی سوننەتی ، بریتییە لە هاتنە گۆڕی «مەعریفەکانی پاشانە». تەواوی ئەو زانستانەی پاشگری (ناسی ـ logy) تەواویان دەکا، وەکوو: مرۆڤناسی، خەڵکناسی، ئوستوورەناسی، دین ناسی و ... دەچنە خانەی ناسینەکانی پاشانە، یان پلە دوو.[٥]

بۆ نموونە مامۆستایەکی ئایینی دوو سەدە لەمەوبەر، خاوەنی روانگەیەکی پێشینی سەبارەت بە ئایین بووە و بۆی نەبووە لەدەرەوە، چاو لە سیستمی دین بکا.بەڵام رۆشنبیرێکی دینی ئەوڕۆ لە روانگەیەکی پاشانەوە و لە دەرەوە چاو لە دەزگای مەعریفی دین دەکا.

ئێستا پرسیار ئەوەیە بەیت ناسانی کورد کە بە پێچەوانەی بەیت بێژان، ناسینێکی پاشانەیان لە سەر ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی هەیە، بە چ شێوەیەك باس و خواسەکانی بەیتناسانەی خۆیان، رەنگرێژی کردووە و بۆ ناسینی

باشتری بەیت چ مۆدێل گەلێکیان بە دەستەوە داوە؟ خوێندنەوەی خێرای ئەو کۆمەڵە بۆچوونانە، یاریدەمان دەدا هەتا کاری ناسینی بەیت لە سیفرەوە دەست پێ نەکەین و ئاگاداری بۆچوونی کەسانێکیتر بین کە لەم زەمینەیەدا، کاریان کردووە و ماندوو بوونە و بەئاکامی گرینگیش گەیشتوون.

سەرجەمی ئەو لێکۆڵینەوانە، بە یەك شێواز و لەیەك مەیداندا بەڕێوەنەچوونە. توێژەرەوەی وا هەبووە کاری لەسەر لایەنی مۆسیقایی بەیت و باو کردووە و هی واش هەبووە کاری لە سەر فۆرم و ناوەرۆکی دەقی بەیتەکان کردووە. بەگشتی تا ئێستا، بە چوار ئاڕاستەی* جیاوازەوە، کاری لێکۆڵینەوە لە سەر بەیت کراوە:

١- لێکۆڵینەوەی مۆسیقایی

٢- لێکۆڵینەوەی مێژوویی ـ جوگرافیایی

٣- لێکۆڵینەوەی رەخنەیی ـ ئەدەبی

٤- لێکۆڵینەوەی بڵاو

لە شێوە لێکۆڵینەوەی یەکەمدا، ئەو دەزگا مۆسیقاییانە کە ئاوازە فۆلکلۆرییەکان سەر بەوانن، بەسەر کراونەتەوە. لەم بارەیەدا گوتوویانە ئاوازی حەیران، سەر بە دەزگای بەیاتە و ئاوازی لاوك سەر بە دەزگای حیجازە. هەروەها گوتوویانە حەیران جگە لە سەر دەزگای بەیات، زۆر بە رێك و پێکی لەسەر دەزگای حیجازیش دەگوترێتەوە.[٦]

دەزگاکانی بەیات و حیجاز هەر دووکیان پاشکۆی دەزگای «شوور»ن و دەزگای شووریش یەکێکە لەو حەوت دەزگا مۆسیقاییە بەنێوبانگەی ئێرانی. ئەم حەوت دەزگایانە ئەمانەن: ١ـ ماهوور ٢ـ هومایوون ٣ـ سێگا ٤ـ چوارگا ٥ ـ شوور ٦ ـ نەوا ٧ ـ راست یان پێنجگا.[٧]

---

* - approach ڕوویکرد

هەڵبەت لەناو پاشکۆکانی دەزگای شوور، بەیاتی تورك (یان بەیاتی زەند) و بەیاتی کورد هەیە. ئەوانەی وا پێیان وایە ئاوازی حەیران سەر بە دەزگای بەیاتە، دەسنیشانی چەشنی بەیاتەکەیان نەکردووە.

جگە لەمە، لەپۆلێن کردنی جۆرەکانی حەیراندا لەرووی چۆنیەتی دەنگ ـ هەڵبرینی بەیت بێژ و پلەی بەرزی یان نزمی دەنگی، دوو شێوە حەیرانیـــــان لێك جیا کردۆتەوە:

ئەلف ـ حەیرانی مەجلیسی: شێوە گوتنێکی نەرم و هێمنی هەیە. «هەر ئەو کەسانە کە لەمەجلیسەکەدا دانیشتوون، گوێیان لێیە و دەنگەکە لەوکۆڕە دا دەپەنگێتەوە»[٨]

ب ـ حەیرانی سەرچیایی: هەڵدان و هەوایی و سواریشی پێ دەگوترێ. لەم شێوە گوتنەدا، بەیت بێژ ئەوەندەی پێی بکرێ دەنگ هەڵدەبڕێ و گوتنەکەی درێژەدەکاتەوە.[٩]

لە توێژینەوەکانی مێژوویی ـ جوگرافیاییدا، هەوڵ دراوە مێژوو و ناوچەی سەرهەڵدانی بەیت و هەروەها هێڵی بڵاو بوونەوەی روون بێتەوە.

ئەو ناوچانەی شێوازێکی تایبەت لەبەیتیان لێ‌باو بووە بەم چەشنە دیاری کراون :

١ـ بەیت (بەمانی تایبەتی): ناوچەی موکریان واتە: مەهاباد، میاندواو، بۆکان، شنۆ، لاجان، سندووس و سەردەشت.

٢ـ حەیران: ناوچەی موکریان، دەشتی هەولێر، شەقڵاوە، هیران، هەریر، سەلاحەدین، کۆیە، رانیە، قەڵادزێ و رەواندز

٣ـ لاوك: هەموو ئەو ناوچانەی ئاخافتنیان بە زاراوەی کرمانجی باکوورە.

زۆربەی ئەو باس و خواسانەی لە سەر مێژوو یان شوێنی سەرهەڵدانی بەیت و باو کراون، پێوەندییان بە بابەتی حەیرانەوە بووە. لەم بارەیەدا گوتراوە حەیران لەسەردەمی ئاژەڵداریدا سەری هەڵداوە و لە سەردەمی

دەرەبەگایەتیدا، پەرەی سەندووە واتە هۆی برەوی حەیران و بەگشتی بەیت، دیاری کرانی جیگە و پێگەیەك بۆ خۆشخوان یان بەیت بێژ لە ناو نیزامی ژیانی دەرەبەگایەتی دا بووە.مامۆستا هێمن ئەو بابەتەمان ئاوا بۆ روون دەکاتەوە:

**«دیارە خۆشخوان وەك هونەرمەندێك چاوی لێتەدەکراو رێزی لێتەدەگیرا، بەڵام لە کوێخا و گزیر و سەرکار و پاکار و باب نۆکەر و غوڵام و چاپەز و بەردەست ، ماقووڵتر بوو. مەڵی بوو لە دیوەخان لە سەر چۆك دابنیشێ، خەنجەر بچەقێنێ و ئانیشکی وێ بدا و جا گوتن بڵێ»[١٠]**

لە بۆچوونی هێندەك بەیتناسدا، دوو باسی «هێڵی بڵاو بوونەوەی حەیران» و«شوێنی سەرهەڵدانی ئەو بابەتە فۆلکلۆرییە» یەك دەگرن و دەبن بەیەك باس. بە واتایەکی وردتر باسی یەکەم دەبێتە بەڵگەی بانگەشەی دووهەم.

چ ئەو کەسانەی پێیان وایە حەیران لە دەشتی هەولێروە سەری هەڵداوە و پەلی هاویشتووە بۆ موکریان و چ ئەو کەسانەی بۆ چوونی پێچەوانەی ئەوەیان هەیە، هەر دووك چۆنیەتی کۆچ و کۆچباری خێڵە کوردەکانیان کردووە بەبەڵگەی بۆچوونەکانیان. دەستەی یەکەم پێیان وایە خێڵە کوردەکان بە دوو رێگادا کۆچی گەرمێن بۆ کوێستانیان کردووە.

**رێگای یەکەم** لەقەراج و کەندیناوە دەستپێدەکا و بەرەو سەفین و رەواندز درێژەی دەبێ و لەوێشەوە دەگاتە موکریان.

**رێگای دووهەم** لەدەشتەکانی خوارووی هەولێرەوە دەست پێدەکا و بەرەو ناوچەکانی بیتوێن و پشدەر دەکشێ و لە کۆتاییدا دەگاتە موکریان. [١١]

رێگای یەکەم:

موکریان ◄—— سەفین و رەواندز ◄—— قەراج و کەندیناوە

رێگای دووهەم:

موکریان ⟵ کۆیە و بیتوێن و پشدەر ⟵ دەشتەکانی خوارووی هەولێر

ئەو دەستەیە پێیان وایە لەبەر ئەوەی کۆچەرەکان بەرێگەی یەکەمدا بەماوەیەکی کەمتر گەیشتوونەتە کوێستان، هەر بۆیە ئەو رێگایە، سەرەکی‌تر بووە. بناغەی بۆچوونەکە لە سەر ئەم تێزە دادەمەزرێ کە خێڵە کۆچەرەکان لەو هەوار گواستنەوەیەدا، داب و نەریت و هونەر و زانستەکانیشیان گواستۆتەوە و شەقڵ و مۆرکی شێوەی ژیانی خۆیان لە سەر خەڵکی ناوچەکە دا بەجێ هێشتووە.[١٢]

جگە لەو بەڵگەیە، ناوی شوێن و ناوی کەسان و شەقڵی بن زاراوەیەکی تایبەتیش ـ کەوا هەیە ئەو ناو وبن زاراوانە، تایبەت بەکوردستانی باشوور بن ـ بۆ سەلماندنی ئەو بۆچوونە قسەیان لێ کراوە.

کەچی لە لایەکی دیکەوە، دەستەی دووهەم، رایەکی تریان، بە بەڵگەگەلێکی جیاوازەوە دەربڕیوە. لەو بارەیەدا گوتوویانە:

«گەرچی حەیران لەدەشتی هەولێردا باو بووە، بەڵام یەکەم جار، لەو وێوە سەری هەڵنەداوە.» «چونکە کورد میللەتێکی شاخ نشین بووە، ژیاری ئێمە لە ئەشکەوت و گەلیانەوە پەخش بۆتە پێ دەشت و دەشتاییەکان. هەموو بەڵگە مێژووییەکانیش، ئەوە دەسەلمێنن کە رووی کۆچ و کۆچباری خێڵ و عەشیرەتەکانمان، لە بەرزایی ئەو کێوانەوە بەرەو دەشتاییەکان هاتووە»[١٣] سەبارەت بە ناوی شوێن و کەس و شەقڵی بنزاراوەیەکی تایبەتیش، بۆچوونی دەستەی یەکەم بەو شێوەیە رەتکراوەتەوە:

«لەحەیراندا بە پێچەوانەی بابەتەکانی‌تری فۆلکلۆری، کە تەنیا مۆرکی یەك بنلەهجەیان پێوەیە، تێکەڵاوی بن لەهجەیی بەرچاو دەکەوێ. ئەوانەی دەیانەوێ لەرووی بنلەهجەی حەیرانەوە روونی بکەنەوە سەرچاوەی حەیران بۆ وێنە لە فلان ناوچە سەری هەڵداوە،

تووشی هەڵە دێن.هەروەها ناوی چەند عەشیرە و کێو و شوێن کردنە بەڵگەش هەر هەڵەیە چوونکو هەر بەیت بێژەی بە پێی ئەلاقە و هۆگری کە بەناوچەی خۆیەوە هەیبووە، ناوی هەندێ شوێنی لای خۆیانی تێکەڵاوی ئەوحەیرانە کردووە کە فێری بووە»[١٤]

لێرەدا، ئەم پرسیارە دێتە گۆڕێ کە ئایا هیچ ڕێگایەك بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو کێشەیە و گەیشتن بە بۆچوونێکی دروست و یەکجارەکی لەم بارەیەدا هەیە؟

لەراستیدا ئالۆزی و پشێوی لەم زەمینەیەدا، ئەو کاتە روودەدا کە بمانەوێ ناوچە و مێژووی سەر هەڵدانی حەیران، بەتەنیا دیاری بکەین. حەیران گەرچی دواتر شەقڵ و شێواز و چوار چێوەی تا رادەیەك تایبەت بە خوی پەیدا کردووە، بەڵام لە بنچینەدا، پێکهاتەی حەیران و وردە رێساکانی ئەدەبی ئەو بابەتە فۆلکلۆرییە، لە بەشێکی چوارچێوەی بەربڵاوی بەیتدا وەبەرچاو دەکەوێ.راستە لە هێندەك ناوچەی کوردستاندا، هەر بە تەنیا حەیران رمێنی زۆری هەیە، بەڵام حەیران خۆی سەر بە بنەماڵەیەکی تایبەتەو باوك و برای خۆی هەیە.

لە فەسڵەکانی دوایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا، بەوردی باسی ئەوە کراوە کە چۆن رێساکانی پێکهاتەی حەیران، دەبنە بەشێك لە رێساکانی بەیت بە مانای گشتی. کەواتە قسەکردن لە مێژووی سەرهەڵدانی حەیرانیش، بەشێکە لە باسێکی گشتی‌تر کە بریتی‌یە لەباسی مێژووی سەرهەڵدانی بەیت و باو.لە مێژووی باس و خواسەکانی بەیتناسیدا، زۆر جار هەوڵی ئەوە دراوە حەیران وەکوو بابەتێکی تەواو جیاواز و هەڵکەوتە، تەنانەت وەکوو بابەتێکی سەرووتر لە فۆلکلۆریش چاوی لێ بکرێ. با لێرەدا، ئاورێك وەسەر دوو نموونە لەو هەولانە بدەینەوە:

«زۆر کەس لەوانەی لەحەیران دواون هەروەها گوێگرانی حەیرانیش حەیران بە ئاوازێکی فۆلکلۆری تێ دەگەن، وا دەزانم ئەمە زۆر راست نیە. لە بەر ئەوەی هەر حەیرانبێژێك حەیرانی خۆی هەیە و بە ئازادی خۆیدا هەڵدەڵێ. یان باسی رووداو و بەسەرهاتێك دەکات

کە بە سەر خۆی هاتووە یان بۆیان گێڕاوەتەوە. لەوانەیە هێندەک لەحەیرانبێژان، حەیران لە ئەوانیتر وەر بگرن و بیڵێنەوە بەڵام بە شێوەیەکی گشتی، حەیران لەو جۆرە ئاوازانەیە کە وەکوو دەق دەماودەم ناکەن و لە نەوەیەك بۆ نەوەیەکیتر ناگوازرێنەوە. ئەمەش بەپێچەوانەی پێناسەی فۆلکلۆرە کە دەماودەم دەکات و لە زارێکەوە دەپەڕێتە سەر زارێکیتر»[١٥]

نموونەکەیتر، فۆلکلۆری بوونی حەیران دەسەلمێنێ، بەڵام دیوەخانی بوونی حەیران وەکوو جۆرەکانیتری بەیت و باو ڕەت دەکاتەوە:

«حەیران بێژ بە پێچەوانەی لاوك بێژان کە پیشەیان لاوك دانانەوە و هەر یەکەی سەر بە ئاغایەك یان میرێکن، سەر بەکەس نیە. لاوك بێژ بە قارەمانێتی و ئازایی و شەڕ و شووری نێوان عێل و عەشیرەتی کوردان یان شەڕی کوردان دژی بێگانەدا هەڵدەڵێ، یان چیرۆکێکی دڵداری لە کۆشك و دیوە خانی ئاغا و میران دەگێڕێتەوە و بۆ ئەوە پاداش و خەڵات دەکرێ و مووچانەی تایبەتی خۆی هەیە. کەچی حەیران بێژ قەت لای ئاغایەك ڕانەگیراوە. هونەری حەیران هونەری بازرگانی نیە، بەلکوو وەك دەڵێن هونەر بۆ هونەرە»[١٦]

دیارە ئەو بیرۆکەیەش بەم بۆچوونە واقیع بینانەیەوە ڕەت دەکرێتەوە کە حەیران لەدیوەخان و مەجلیسی ئاغایاندا گوتراوە بەڵام بۆ ئەوان نەگوتراوەوە بە شان و بازووی ئەوانیدا هەڵنەکوتووە.[١٧]

بە کورتی گەرچی شیعری فۆلکلۆری کوردی لە حەیراندا گەیشتووە بەو پەڕی ناسکی خۆی، بەڵام ئەو بابەتە، نابێتە بەڵگەی دابڕانی ریشەیی حەیران لە زەمینەی تایبەتی خۆی.

باسی مێژوویی جۆگرافیایی لە سەر بەیت و باو، با بە وەبیرهێنانەوەی ئەو بابەتە، کۆتایی پێ بێنین کە واهەبوو لێکۆڵینەوەی مۆسیقایی، تێکەڵ بە توێژینەوەی جوگرافیایی بکرێ و ئاکامی گرنیگیشی لێ بکەوێتەوە.مامۆستا محەمەدی حەمەباقی لە «مێژووی مۆسیقای کوردی»دا دەڵێ:

« من پێم وایە ناوچە زۆزان و سەختەکان پلەی دەنگ و ریتمی مۆسیقا و گۆرانی‌یان، توند و گورجە و تا بەرەو ئاران و پێدەشت و هەردە و هەڵەتی باشووریش شۆڕتر ببینەوە، ریتمی مۆسیقا و گۆرانیەکان هێمنتر و خاوتر و ئارامتر ئەبنەوە وەك ئەوەی ئەگەر لە جوگرافیای لاوك و لاوژەو حەیران و ساوچەمانەدا کە لە هەرێمە کوێستان و سەختەکاندان، ریتمی مۆسیقایان گورج و حەماسی بێت، ئەوا لە پێدەشتەکانی گەرمیانی دەورو بەری کەرکووك و سلێمانی و کرماشاندا، مەقامی خەمین و لەسەرخۆی وەك ئای ئای و قەتار وخاوکەر و هۆرە ئەبیستین»[١٨]

ئەو بۆچوونەش دەتوانێ پێوانەیەکی لەبار بێ بۆ گەیشتن بە شوێنی سەرهەڵدانی بابەتەکانی فولکلۆری.

توێژینەوەی بەیتناسانە، بە پازدان و گەیشتنی بە هەواری لێکۆڵینەوەی رەخنەیی ـ ئەدەبی قۆناخێکی تازەی لێ دەستپێکراوە، لەم شێوە لێکۆڵینەوەیەدا، لایەنەکانی غەیرە ئەدەبی بەیت، بە قازانجی لایەنی ئەدەبی پشتگوێخراون. پێویستی ئەم کارەش بریتی بووە لە «بە دەق کردنی بەیت». واتە بەیتناس هەر لە چوارچێوەی تێکستی بەیتدا هەڵسووڕانی تاوتوێ کەرانەی خۆی بەرێوە بردووە. هەڵبەت لەم ئاستەشدا هەوڵەکان هەموویان یەکدەست و یەك شێواز نەبوونە. بەگشتی لەبەستێنی توێژینەوەی رەخنەیی ـ ئەدەبیدا چوار زەمینەی جیاوزای لێکۆڵینەوە، بەکردەوە لە مێژووی بەیتناسیدا چالاکیان تێداکراوە:

١ـ لێکۆڵینەوەی پۆلێن کارانە

٢ـ لێکۆڵینەوەی راڤەکارانە

٣- لێکۆڵینەوەی بەراودرکارانە

٤ـ لێکۆڵینەوەی پێکهاتە خوازانە

لە زەمینەی یەکەمدا بەشەکانی جیاجیای بەیت و باوی کوردی لە سەر بنەمایەکی تایبەت، پۆلێن کراون. هەڵبەت ئەو بنەمایە هەرچی بووبێت شتێکی غەیری‌فۆرم‌وپێکهاتەی جۆرەکانی بەیت و باو بووە.چونکە ئەگەر پۆلێنکردنەکە لە سەر بناغەی فۆرم و پێکهاتەوە بوویێ، ئەو هەوڵە دەبوو بە لێکۆڵینەوەیەکی پێکهاتە خوازانە.بەیتەکان بە گوێرەی جیاوازی بابەتیانەوە دابەشکراون بە:

- **بەیتی دڵداری ـ حیماسی** وەکوو: مەم و زین، خەج و سیامەند، لاس و خەزاڵ، مێر و وەفا و شۆڕمەحموود و مەرزینگان

- **بەیتی مێژوویی** وەکوو: بەیتی دمدم، هەمزاغای مەنگوڕ و باپیراغای مەنگوڕ.

- **بەیتی ئایینی** وەکوو:بەیتی قەبران، سایل، محەمەدی حەنیفە، بەیتی سەیدبرایم، بەیتی مەدینە و ئاقیدەی ئیسلامییەت.

- **بەیتی عیرفانی** وەکوو : شێخی سەنعان و زەمبیل فرۆش.[١٩]

دیارە ئەو دابەشکردنە، لە پانتای بەیت ـ بە مانای تایبەتی ـ دا بووە. بەیت و باو بە مانای گشتی بە گوێرەی زاراوەی دەقی بەیت، بەم شێوەیە دەستەبەندی کراون:

- حەیران: ئەو جۆرە شێعرە میللی‌یەیە کە بەدیالێکتی کرمانجی خواروو دەهۆنرێتەوە .
- لاوک: ئەو جۆرە شێعرە میللی‌یەیە کە بەدیالێکتی کرمانجی سەروو دەهۆنرێتەوە[٢٠]

ئەو بۆ چوونە سەربارەت بە حەیران و لاوک بۆچوونێکی راستە، بەڵام ئەگەر بەنیازی بە دەستەوە دانی پێناسەیەکی یەکجارەکی بۆ چۆارچێوەی لاوک و حەیران بێ، وێناچێ زانیارییەکی بە کەڵکی لەخۆ گرتبێ. ئەو کەسەی بە دوای وەچنگ خستنی زانیاری لەمەڕ بەیت و باوە پێویستی بە کۆمەڵە زانیارییەکی زیاتر لە زاراوەی لاوک و حەیران هەیە و لە راستیدا، لاوک و حەیران و بەیت ( بە مانای تایبەتی) هەر لە زاراوەیاندا لێك جیا نابنەوە. هەڵبەت با

ئەوەش بزانین لە بەشی باکووری کوردستانیشدا شێوە گوتنێك هەیە کە«حەیرانۆك» ـ ی پێ دەڵێن. جگە لەوە وا هەبووە وشەی بەیتیش لەزاراوەی کرمانجی ژووروودا دەکار بکرێ وەکوو «بەیتاکەوا».

زەمینەی دووهەم پێوەندی بە شەرح و لێك دانەوەی دەقی بەیتەکانەوە هەیە. مرۆڤ لە کۆنەوە، وێڕای دەربەستی ئایین بوون، دەربەستی راڤە، و لێکدانەوەی دەقی کتێبە پیرۆزەکانیش بووە. بەرەبەرە جگە لە لێکدانەوەی بەکردەوەی دەقەکان زنجیرە یاسا و رێسایەکی بۆ ئەو کارە دیاری کردووە و ناوی لێناوە «فەننی هێرمنۆتیك » دواتر ئەو فەننەی نەك هەر بۆ راڤەی کتێبی پیرۆز، بگرە بۆ لێکدانەوەی دەقە ئەدەبییەکان و تەنانەت زۆر بابەتی دیکە وەکوو حقووق و یاساش، بەکار هێناوە.

بە کورتی لێکدانەوەی دەق چ لە چوارچێوەیەکی زانستی دابێ و چ بە شێوەی زەوقیوتاکەکەسی بێ،چالاکییەکە کەمرۆڤ لەکاتی بەرەوەرووبوونەوە لەگەڵ دەقدا بە رێوەی دەبا.

هەر تێگەیشتنەك لەدەق، جۆرە لێکدانەوەیەکی دەقە بەم پێیە ئەو کەسەی لە دەقی بەیتێك تێگەیشتبێ، لێکدانەوەیەکی تایبەتیشی لە سەر ئەو بەیتە هەبووە. سەرجەمی ئەو شەرحانە، لە دووتوێی وتار و بابەتە چاپکراوەکاندا، لێکۆڵینەوەی راڤەکارانەیان بەرهەم هێناوە.

بۆ وێنە با بزانین لێکدانەوەی هێمنی موکریانی لە سەر «مەم و زین » چیە؟ مامۆستا هێمن پێیوایە بەیتی مەم و زین نیشانەکانی ئایینی زەردەشتی پێوە دیارەو هەر لەسەر بناغەی ئەو بۆچوونەشەوە بەیتەکە ئاوا لێکدەداتەوە:

«لە سەرانسەری بەیتی مەم و زیندا، لە نێوان خودای خێر و خودای شەڕدا ملانەیە. ملانەیەکی توند و بەربەرەکانێکی سەخت و لە ئاشتی نەهاتوو. ئەگەر بەکرمەرگەوەڕ، بەکری شۆڤار و بەدفەڕ وەك خودای شەڕ، دەیەوێ مەم و زین، ئەم کچ و کوڕە پاك و خاوێنە ریسوا بکا، خودای خێر، قەرەتاژدین گەورەترین مەردایەتی و فیداکاری دەکا و بۆ

پاراستنی ئابڕووی ئەوان، ماڵی خۆی ئاگر تێبەردەدا....[ کەچی دوایە] تاریکی بەری ڕووناکی دەگرێ، خوای شەڕ بەسەر خودای خێردا زاڵ دەبێ. بەکرەشۆڤار واز ناهێنێ، ناهێڵێ ئەو کچ و کوڕە بێتاوانانە بە ئاوات بگەن. بەڵام دیسان ڕووناکی پەیدادەبێتەوە، خێر زاڵ دەبێ، شەڕ تێدەشکێ.بەکر دەکوژرێ، ئەمما درەنگ، پاش لەنێوچوونی ئەم دڵبەر و دڵدارە بێمرادانە»[٢١]

نموونەیەکی تر لێکدانەوەی سوارەی ئیلخانیزادە لەسەر بەیتی سەیدەوانە. سوارە لە وتارێکدا، باسی دوو بەرهەمی بیانی و خۆماڵی واتە «هاملێت» و «سەیدەوان» دەکاو بە لەبەریەك ڕانانیان بە چەند ئاکامی راڤەکارانە دەگا.

بە بۆچوونی سوارە، تەوەرەی چیرۆکی هاملێت، لەبەر یەك راوەستانی دوو چەمکی «بوون» و «نەبوون»ە. بەڵام بناغەی دەقی سەیدەوان، بریتییە لە دژوەستانی «شین» و «شایی». عەبدولعەزیزی داستانی بۆچی دوای جوانە مەرگ بوونی کوڕەکانی بڵاوەی بەمیوانانی نەکردووە؟ بۆچی ئەو دەمەی دەبوایە شینگێڕ بێ، میوانداریی شایی گێڕانی کردووە؟ بە بڕوای سوارە، عەبدولعەزیز، هەڵبژاردنی خۆی بە ڕێوە بردووە و لە بەرامبەر شیندا، شایی بە مەبەستی ڕەسەنی ژیان زانیوە. جەوهەری ژیان ئەو کاتە ڕێزی لێ دەگیرێ کە کوڕان و کچانی عێڵ، دەست لە ناو دەستی یەکتر سەر خۆش بن و دڵیان بێتە جۆش. کە واتە عەبدولعەزیز، وشیارانە شایی بە شین گۆڕیوەتەوە. سوارە دوای ئەو باسانە، بەو ئاکامە دەگا کەسەیدەوان لە هاملێت بەرزترە.[٢٢] هەڵبەت باسکردنی هاملێت لە لایەن سوارەوە، هەر بە تەنیا بەراوردکارییەکی سادە نەبووە بەڵکوو ویستوویە لەم ڕێگایە و بەو بیانووەوە، لێکدانەوەی خۆی لە بارەی سەیدەوان پەروەردە بکا.

لە بەرامبەر ئەو بوچوونەی سوارە، سەبارەت بە هەڵبژاردنی بیرمەندانەی عەبدولعەزیزدا، راڤەی دیکەش هەبوونە. بە پێی ئەو راڤانە، عەبدولعەزیزی داستانی، نەك بە هۆی بیرکردنەوەیەکی مەیلەو فەلسەفی، بەڵکوو لە بەر خۆبەزلزانی و لە ترسی شکانی شان و شکۆی عەشیرەتی خۆی، بڕیاری ئەوەی داوە دەستی دیلان بە کوڕ و کچانی عێل بەرنەدا.[٢٣]

ئەو بۆچوونانە، هەموویان لەچوارچێوەی راڤە جۆراوجۆرەکاندا گووراون و پەروەردەکراون و هەموویان دەچنە خانەی لێکۆڵینەوەی راڤەکارانەوە.

زەمینەی سێهەم، واتە لێکۆڵینەوەی بەراوردکارانە، سەر بەو چوار چێوە توێژکارانەیە کە فارس پێی دەڵێن «ادبیات تطبیقی». لە بەستێنی بەراوردی بەیتی کوردی لەگەڵ ئەدەبی گەلانیتردا، ئەوەندەی من ئاگادار بم کتێبێك بە زمانی فارسی نووسراوە بە ناوی«شاهنامه و ادبیات عامیانه کردی»، کە لەم دواییانەدا لاوێکی ئازەری نووسیویە.

لەلێکۆڵینەوەی ناوبراودا، بیست و دوو بەیتی کوردی لەباری چۆنیەتی پێوەندییان لەگەڵ شانامەی فیردەوسی و شوێن وەرگرتنیان لەو شوێنەوارە فارسییە، کاریان لە سەر کراوە و باسکردن و دووان لە حەفتا و چوار وێکچوون لەنێوان دەقیشانامە ودەقی ئەو بەیتانەدا، ناواخنی ئەم کتێبەی پێك هێناوە.بۆ نموونە لە خاڵی ٤٣ دا باسی سێزدە کەسایەتی وەکوو«جەمشید و گەرشاسب و سام و نەریمان و....» کراوە کەناویان لەو بیست و دوو بەیتە کوردییەدا هاتووە و ئەو ناوانە، لە ئەسڵدا هی کەسایەتییەکانی شانامەی فیردەوسین. نووسەر وەك بۆ خوی ئاماژەی پێدەکا، نیازی ئیسپاتی خۆر ئاسایی شانامە و قووڵایی شوێندانانی ئەو بەرهەمەی هەیە. لە راستیدا، هێندەك لەو خاڵە هاوبەشانە ـ وەك ناوی ئەو کەسایەتیانەی باسیان کرا ـ لەژێر کارتێکردنی شانامەوە هاتوونەتە ناو ئەدەبی زارەکی کوردی، بەڵام لە هەموو ئەو وێکچوونانەڕا ناتوانین بەئاکامی سەرچاوە بوونی شانامە بگەین. لەرەخنەی ئەدەبیدا وشەی Archetype ـ مان هەیە. فارسەکان بە«کهن الگو»، و«صور مثالی» و «نموونە ازلی» و«آغازینه»یان وەرگێڕاوە. نموونەی ئەزەلی، بەو مۆتیف ومەبەست و بابەتانە دەڵێن کەبەبێ ئەوەی گەلانی جیهان لەیەکتریان خواستبێ، لەناو ئوستوورە و ئەفسانە و حەقایەت و بەگشتی لە ناو ئەدەبی کۆنیاندا دووبارە بووبێتەوە. کە واتە ناکرێ هەر کات دوو مەبەستی وەك یەکمان لە ناو ئەدەبی دوو نەتەوەدا دۆزیەوە، راستەوخۆ بە ئاکامی سەرچاوە بوونی یەکێکیان و شوێن وەرگرتنی ئەویتریان بگەین.

بەڵام ئەو کتێبە، سەرجەم زانیاری باشی تێدایە. وەك نموونە خاڵی یازدەهەم لەوێکچوونەکان پێکەوە دەخوێنینەوە:

«لە بەیتی سەیدەواندا عەبدولعەزیزە کوڕەی داسنی، نابەئاگایانە کوڕی خۆی دەکوژێ.... شەڕی نابەئاگای دوو خزم (وەك باوك و کوڕ و برا و برا و...) و کوژرانی یەکێك لەو دووانە، بابەتێکی هاوبەشی ئەدەبی جیهانییەو بەرچاوترین نموونەی، داستانی ڕۆستەم و زۆراب لەشانامەدایە. ئەوەی لەتوێکڵ و ڕواڵەتی ریوایەتی شانامە دەسگیرمان دەبێ، ئەوەیە کە تەهمەتەن،کوڕی خۆی واتە تازە پاڵەوانی هەڵمەت بەری توورانی ناناسێ و بە نەناسیاوی دەچێتە شەڕی و دوای بریندار کردنی و دیتنی مۆرەی خۆی لەباسکیدا، دەزانێ کێیە.

مێندەك لە لێکۆڵەرەوان، بە بەڵگە هێنانەوە لە چەند نیشانەی ناو دەقی داستانی ڕۆستەم و زۆراب، لەسەر ئەو بڕوایەن کە ڕۆستەم بەناسینەوەی تەواوی کوڕی خۆی، زگی دەدڕێ، هەتا سۆز و خۆشەویستی لە پێناو بڕوا دا بکاتە قوربانی. هەڵبەت ئەگەر ئاواش بێ، گەرچی بەئەسەرێکی کەمترەوە، بەڵام دیسان زەمینەی تراژێدی داستانەکە ڕادەگیرێ.

لەناو تیرەو هۆزە جۆراوجۆرەکانی جیهاندا، داستانی زۆری ئەوتۆ هەن کە نێوەرۆکیان بریتییە لە شەڕی دوو خزم. بە قسەی خوالێخۆشبوو مامۆستا مینەوی توێژەرەوەیەکی ئینگلیسی بەناوی (potter) هەشتا و چەن نموونە لەم چیرۆکانەی لە کتێبێك بە ناوی «زۆراب و ڕۆستەم» دا کۆکردۆتەوە. شایانی باسە لەناو ئەو چیرۆکانەدا چوار ریوایەت، لە باری بابەت و هانە* و پێکهاتە و وردەکارییەکانیانەوە زۆر وەك یەك دەچن کە بریتین لە:

١- ڕۆستەم و زۆرابی ئێرانی

٢- هیلدە براند و هادۆ براندی ئاڵمانی

٣- کۆکۆلین وکێنلای ئیرلەندی

* - motive انگیزە

٤ـ ئیلیا مۆرمیت و سەکلینکی رووسی و لەگشت ئەو چیرۆکانەدا وەکوو بەیتە کوردییەکە، کوڕ بە دەستی باوکی خۆی دەکوژرێ»[٢٤]

زەمینەی چوارەمی توێژینەوەی رەخنەیی ئەدەبی، بریتی یە لەلێکۆڵینەوەی پێکهاتەخوازانە. پێکهاتەخوازیش وەکوو زانستی راڤە و لێکدانەوەی دەق خاوەنی مێژوویی تایبەتی خۆیەتی. کەچی هەوڵەکانی شێوە پێکهاتە خوازانەش بۆ لێکۆڵینەوەی بەیت، بەئاگایانەو بەپێڕەوکردنی رێ و شوێن و دەستووری مێتۆد گەلی پێکهاتە خوازی، بە رێوەنەچوونە.

لەم شێوە لێکۆڵینەوەیەدا، ژێرخانی دەق و پێوەندی نێوان یەکەکانی دەق، هەروەها رێسا و یاساکانی نێو بەیت، دۆزراونەتەوە و چوارچێوەبەندی کراون و وەکوو پێکهاتەی بەیت ناسێندراون.

لەبارەی فۆرمی بەیتدا گوتوویانە بەیت لەدوو بەشی «تەخت» و «بەند» پێك دێ. بەشی تەخت بریتی یە لەبەشی پەخشانی بەیت. ئەگەر بمانەوێ بە زاراوەکانی تایبەت بە لێکۆڵینەوەی مۆسیقایی بدوێین، دەبێ بڵێین بەشی تەخت ئەو بەشەیە کە بەیت بێژ، بە دەنگ و ئاواز نایخوێنێتەوە و بە قسە دەیگێڕێتەوە. بەشی بەندیش، بەشە شیعرییەکەی بەیتە. مامۆستا قادری فەتاحی قازی لەبارەی بەند لە بەیتدا دەڵێ:

«بەندەکان چەند دێڕی هاوسەروان و بەگشتی دوو جۆرن. جۆری یەکەم ئەو بەندانەن کە دێڕەکانیان کورتن و هەر دێڕەی، لە دەبڕگە تێناپەڕێنێ. جۆری دووهەم ئەو بەندانەن کە دێڕەکانیان درێژن و لەوانەیە دێڕێك، هەتا بیست و دوو بڕگەش درێژ بێتەوە.وا هەیە بەیتێك کە بەندی بە دێڕی درێژی تێدایە، بەندی دێڕکورتیشی تێدا بێ بەڵام بەیتی ئەوتۆش هەیە کە هەر بەتەنیا بەندی دێڕکورتی تێدایە و بەندی بە دێڕی درێژەوە تێدا نەهاتووە. ژمارەی دێڕەکانی بەند بە لانی زۆرەوە پازدە دێر یان کەمێك زیاترە و بە لانی کەمەوە دوو دێڕە. جاری وایە لە سەرەتا یان لەکۆتایی بەندا دێڕێکی بێ سەروا دێ. ئەو دێڕەش هەر بە دێڕی ئەو بەندە حیسێب دەکرێ. لە هێندەك بەندا سەروای ئەوتۆ دەکار کراون کە دەکرێ ناوی

سەروای دەستکردیان پێ بدەین. ئەو سەروا دەستکردانە، بریتین لە هێندەك وشەی لێکنەچوو کە بە زیادکردنیپاشگرێکەوە بوونەتە سەروا» [٢٣]

لەکوردستانی باشوور، وشەی بەند لە حەیراندا، بەمانایەکی جیاواز لەو مانا باسکراوە دەکار کراوە. لەم بارەیەدا گوتوویانە حەیران لە سێ بەندی کورت پێك دێ و گوتنی هەرکام لەو بەندانە، لەوانەیە ئەوپەڕی هەتا دەقیقەیەك بخایەنێ. سەروای ئەو سێ بەندانە دەبێ یەك بن. لێرەدا بەندی یەکەمی حەیران، بە دێڕی یەکەم دەگوترێ، بەندی سێهەم بەدێڕی کۆتایی دەگوترێ و بەندی دووهەمیش بەیەك یا چەند دێڕی نێوان دێڕی سەرەتاو دێڕی کۆتایی دەگوترێ. سەروای ئەو بەندانە یەکن.

پێویستە بڵێین ئەگەر وشەی بەند، بە مانای یەکەم دەکار بکەین، ئەوانە هەموویان دەبنە یەك بەند و بە سێ بەند نایەنە ئەژمار.

هەر لەو زەمینەیەدا، ئەو رایە دەربڕاوە کە جگە لە حەیرانی سێ بەندی کورت، ئیتر حەیرانی رەسەن، لەئەدەبی زارەکی کوردیدا نیە. دیسان ئەو بۆچوونەش لەگەڵ واقیعی ئەدەبی فولکلۆری کوردی یەك ناگرێتەوەو سەرچاوە-گرتوو لە ئاگادارنەبوون لە هەموو جۆرەکانی تێکستی حەیرانە. دەقی ئەوتۆ لە بەردەستدا هەیە کە لە سێ بەند زیاترە و لە پاڵ دەقە سێ بەندییەکان، نموونەی جوانترین و ناسکترین حەیرانی تۆمار کراوە.

جیا لە لێکۆڵینەوەکانی مۆسیقایی، مێژوویی، جۆگرافیایی و رەخنەیی - ئەدەبی، هێندەك توێژینەوەیتر، بە کردەوە بەرێوەچوونە یان بەرنامەیان بۆ داڕێژراوە کە ناکەونە هیچکام لەو خانانەوە و پشت گوێ خستنیان لەم وتارەدا دەبێتە هۆی بێبەری بوون لە ئاگاداری لە سەر بەشێکی بە وەجی لێکۆڵینەوەکانی بەیتناسانە. ئێمە ناوی ئەو کۆمەڵە هەولانەمان داناوە لێکۆڵینەوەی بلاو.

با بەهێنانەگۆڕێ پرسیارێك،تیشك بخەینە سەر گۆشەیێك لەو لێکۆڵینەوانە. بۆچی لە کۆمەڵگای سوننەتی کوردەواریدا، بەیت زەمینەی سەرهەڵدانی بۆ هەبووە و تا ئەو رادەیەش گرینگی پێ دراوە؟

وڵامێکی ئەم پرسیارە بریتی‌یە لە پێویستی تۆمارکردنی مێژوو لە کۆمەڵگایەکدا کە نە دەزگاکانی رەسمی عۆدەداری پاراستنی ئەو مێژووە بوونەو نە نووسینیش تێیدا بە پانەوە باو بووە هەتا خوێندەوارانی ئەو گەلە، ئەو پرۆژەیە بۆ خۆیان بەرێوە بەرن.لە نەبوونی ئەو ماکە باسکراوانەدا، بەیت بێژی کورد بەناو بانگترین رووداوەکانی شوێندانەر لە سەر بیروهەستی جەماوەری گەلەگەی بە شێوەی بەیت دارشتۆتەوە. دیسان هەر لەوڵامی ئەم پرسیارەدا، لێکدانەوەیەکی دەروونناسانە، هاتۆتەئاراوە. وا وێدەچێ ئەو لێکدانەوە دەروونناسانەیە. لەبەستێنی لێکۆڵینەوەکانی بڵاودا بابەتێکی نوێ بێ. کاك «ئەحمەد بەحری» ، جۆرە «دابڕبوونێکی رەوانی» بە هۆی پەرەسەندنی بەیت لەکاتی خویدا دەزانێ: «رەواننناسان لە سەر ئەو باوەڕەن ئەگەر کەسێك بارستی دەردێکی گەورە یا غەمێکی قورس گرانایی لە سەر بکا، بێتوو بۆی بکرجێ پرێسکە بکاتەوە و کوڵی خۆی هەڵرێژێ، هەست بەلەش سووکی و ئاسوودەیی دەکا. ئەم بابەتە لە خولقانی بەیتدا شوێنێکی یەکجار گرینگی بووە»[٢٦]

«دەتوانین بەیت بە جۆرێك کوڵ وکۆ دامرکاندن بزانین چ بۆ ئەو شتانەی لە دەست چوونە و چ بۆ ئەو شتانەی وەدەست هێنان و پێگەیشتنیان دژوار و دوور لەزەینە. مرۆ ئەو دەمەی کەهەستی کرد دەستی بە ویست و دڵخوازەکانی راناگا، پەنای بردۆتە بەر خەیاڵات... ئەم مەبەستە۔ دابڕ بوونی رەوانی ـ یەکێك لە هۆیە هەرە گرینگەکانی پەرەسەندنی بەیت بووە»[٢٧]

دەکرێ لە زەمینەی بەیتناسیدا باسی دەروونناسانەی لەو چەشنە تەنەوەیان پێ بدرێ و ئاکامی باشیان لێ بکەوێتەوە.

کاك «عەلی خزری» لە بارەی ئەو هەوڵە زانستییانەی بەگشتی لە زەمینەی بەیتناسیدا هێشتا بەرێوە نەچوونە بەڵام دەکرێ پرۆژەی لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆر پێك بێنن، پەنجە بۆ چەند بابەت رادەکێشێ:

**یەکەم:** کاری قامووس نووسی بۆ دۆزینەوەو وەسەریەك نانی وشەی رەسەن.

**دووهەم:** توێژینەوەی زمانەوانی بو کارکردن لە سەر شێوەی سینتاکس و تەرکیبی رستە لە زمانی کوردیدا.

**سێهەم:** توێژینەوەی دێرینە ناسی.

**چوارەم** : توێژینەوەی کۆمەڵناسی.

**پێنجەم:** توێژینیەوەی خەڵکناسی بۆ کارکردن لە سەر داب و نەریت و خوو و خدە و کەرەستەی ژیان وەك جلك و ئامرازی جەنگ و راو وهەروەها شێوەی بیناسازی و ... هتد.

**شەشەم:** توێژینەوەی جوگرافیایی لەسەر جوگرافیای کوردستان.

**حەوتەم:** توێژینەوەی فیکری و فەلسەفی. بۆ وێنە بەیتەکانی زەمبیل فرۆش، شێخی سەنعان، شێخ مەند و شێخ رەش، شێخ فەرخ و خاتوون ئەستی و... خاوەنی هێندەك لایەنی عیرفانی و ئوستوورەیین.

**هەشتەم:** توێژینەوەی ئەستێرەناسی. هێندەك لەحەیرانەکان باسی تەقویمی نجوومی و بابەتی پێوەندیدار بە ئەستێرە ناسییەوە دەکەن.

**نۆهەم:** توێژێنەوە لە بارەی پزیشکی سوننەتی.

**دەیەم:** توێژینەوەی مۆسیقایی بۆ دۆزینەوەی هێندەك مەقام و ئاوازی بزری کوردی. [٢٨] (هەر وەك گوتمان تا رادەیەکی زۆر کەم لەو بەستێنەدا کار کراوە) جگە لەو هەموو لێکۆڵینەوانەی لە بەستێنی بەیتدا کراون، یان بۆیان هەیە بکرێن. کەڵکێکیتر لەو گەنجینەیە وەرگیراوە کە جێگەی سەرنج و لێدوانە.

وا هەبووە ئەدیبی کورد بە زمانی بەیت و بە مەنتیق و جیهانبینی تایبەتی بەیت و بەوەرگرتنی بابەتێك لەبابەتەکانی بەر باس لەبەیتدا و بەکورتی بەکەڵك وەرگرتن لەزۆریەك لە تایبەتمەندییەکانی بەیت، دەستی دابێتە، نووسینی پارچە پەخشانێکی ئەدەبی. واتە لەجیاتی ئەوەی بەیت بکاتە هەوێنی چەشنە ناسینێکی تایبەتی،کردوویە بەهەوێنی بەرهەم هێنانی دەقێکی ئەدەبی.گەرچی ئەم هەوڵە بە رواڵەت لە کاری توێژینەوەی بەیت جیایە، بەلام لەراستیدا ئەم چەشنە نووسینە، دەکرێ وەکوو کردەیەکی بەیتناسانە، یان باشترە بڵێین وەکوو ئاکامی راوانگەیەکی بەیتناسانە، بناسرێ. چونکە هەتا کەسێك بەیتی بەباشی نەناسیبێ،ناتوانی زەرفیەتەکانی زمان ومەنتیقی بەیت بۆ بەرهەم – هێنانی دەقێکی تازە هەڵێنجێ.

بۆ نموونە بابەتی پایزە، لەو پارچە پەخشانەی خوارەوە دا بۆتە تەوەرەی باسی وتارێك:

«کەژ و چیا زەرد هەلگەڕا. رۆژ کورت بوونەوە. چیان بەگوڕچوانەوە نەما... جحێڵ لە کوێسوانان، کچ لە دەراو بانان خەریکی باو باوێنن و گراویلکەی خۆیان بە سەدان کچە شازادە ناگۆڕنەوە. خێڵ بەرەوخوار هاتنەوە. جێ هەوار چۆڵ بوون. دوایی هات چاو بڕکێنی شوان لەگەڵ بێری بۆزەڵە و قۆلچاخ لەشان. تەنیا وەلام دەنێرن و بەیت و باو پێك هەڵدەڵێن و پایزە ساز دەکەن و کوفڵ و کوڕ دڵی لە کوڵیان دادەمرکێنن. هەر چەند پاییز لێکیان دوورکاتەوە بەڕادەی ئەو دوورییە، دڵیان نیزیکە. ئاگایان لێکە، کیژ (لەوەی دەترسێ پەڵەبارانێکی بە رەحمەت لەوێ بباری. بدا لە عێسقان، لە قەلاسقان، ران و رکێفی دەعارەب و عارەبە سواران، بدا لە گوێی دەکەمبەرێ، بشکێنێ جووت کاریتەی دەرەشەرێحانی)

کوڕ وەیادی قەول و قەراری دەکەوێ کە تێکەڵاوی بۆنی خۆشی بەهار ببوو، بەکەزێی شینی کیفۆك قایم کرابوو دەڵێ:

«قەول و قەراری خۆم لەگەڵ گراویلکێ دەبەست، ئەوی محەلی بەهارێ کە ماڵ پێ دەچوونە کوێستانێ، ئەلحانەکانە ئەوە پیرە پاییزە.خەزەڵوەرێنە، خێڵ سەر بەرەو ژێرە، لەمن هاتۆتەوە مەحەلی دە دەست لێك بەردانێ»[٢٩]

هەروەها با چاوێك لەچۆنیەتی کەڵك وەرگرتن لە زمان و مەنتیقی بەیت لەم پارچە پەخشانەدا بخشێنین:

**«هەر لەو دەمەوە کە دەستی تامەزرۆی بیروهەستی هۆگرم بەرەو بەرۆکی بەیت و بەندان هەڵچووە، ژنێکی شمشاڵ قەدی کراس ئاو دامانی بۆتە هاوڕێی رۆژ و شەوانم. ئەم باڵا بەرزە جاری وایە ئەگریجە خاوە. زوڵف سێبەنگی، قژی رەشەرێحانەی سەر دێراوانە. کوڵمەی سێوە لاسوورەی لەباخەوان یاخی، پشتێندی ئەسڵەپەشمینە، پەراوێزی کولێجە قوتنییەکەی لە پەلکی سوورە گوڵە. ئاسکی سڵی چاوگەش، مامزی دایکی کاران، تەیری شاقەل بە خوناوکە، نمەنمەی باران و کلووی بەفرە،بەرەوور لە سەر سینگی شەڕیانە، کوێستانی خاڵخاڵی رەنگین، لەنجە شیرین کۆتری، بزەی یەکەم گزینگی خۆر دەخاتەوە یاد. ئەم هاوڕێیە، هەموو رۆژی لەگەڵ هەتاو، هەموو شەوێ لەگەڵ ئەستێرەکان بە سەرم دەکاتەوە»**[۲۰]

کەڵك وەرگرتنی زیاتر و بەرفراوان تریش بریتی بووە لە بەشێعرداڕشتنەوەی تەواوی بەیتێك لەلایەن شاعیرێکەوە و گۆڕینی بەیتەکە لە باری فۆرم و پێکهاتەوە.بە نێو بانگترین نموونەی ئەو جۆرە دارشتنەوەیە، مەم و زین ـی ئەحمەد خانی‌یە. زۆرکەس ئێستاش،بە هەڵە نەزمی مەم و زینی خانی بە بەیت ناو دەبەن. دیارە هەژاریش لە سەر راوە مەم و زینی بەزاراوەی سۆرانی کردۆتەوە بە شێعر. جگە لەمە، دمدم نامەی «مەلا کەریمی فیدایی» شایانی باسە.

بەیت جگە لە شێوەی نەزم بە شێوەی رۆمانیش داڕێژراوەتەوە کە نموونەکەی «قەڵای دمدم»ی عەرەب شەمۆیە. هەروەها هێندەك بەیتی کوردی شانۆشیان لێ ساز کراوە.

ئەوە کورتەیەك بوو لەو هەوڵ و تەقەلایانەی لەپانتای بەیتناسیدا بەرێوەچوونە. بۆ ئەوەی چاوێکی خێرا بە سەرجەمی ئەو لێکۆڵینەوانەدا بخشێنینەوە. با تەماشایەکی هێڵکاری ژمارەیەك بکەین.

هێلکاری ژمارە ١

## پەراوێزەکان:

١ـ ئۆمەر دزەیی ـ بەرنامەی تایبەتی بەشی کوردی رادیۆی ئامریکا

٢ـ ئەمیر حەسەنپوور ـ سەرچاوەی ژمارە ١

٣ـ غەفوور مەخمووری ـ حەیران، چەمك ناوەرۆك، سەرهەڵدان ـ هەولێر ـ وەزارەتی پەروەردە ـ چاپی یەکەم ـ ٢٠٠١

٤ـ ئەحمەد بەحری ـ گەنجی سەریەمۆر ـ سلێمانی ـ پەخشی سەردەم ـ چاپی یەکەم ٢٠٠١

٥ ـ عبدالکریم سروش ـ فربەتر از ایدئولوژی ـ تهران ـ موسسهٔ فرهنگی صراط ـ چاپ سوم ـ ١٣٧٥ ص ٣٥٢

٦ ـ ئامانج غازی رەواندزی ـ حەیران و مەرگی غەریبان (کۆمەڵە وتار) ـ چاپی یەکەم. ١٩٩٠ـ ل ٦٠

٧ـ محەمەد حەمەباقی ـ مێژووی مۆسیقای کوردی ـ چاپی یەکەم ١٣٧٥ ـ ل٢١

٨و٩ ـ سەعدوڵڵا شێخانی ـ حەیران و مەرگی غەریبان (کۆمەڵە وتار) چاپی یەکەم ١٩٩٠ ل ١٩

١٠ ـ ئۆسکارمان - تحفه مظفریه- پێشەکی و ساخکردنەوەی و هێنانە سەر رێنووسی کوردی هێمن ـ مەهاباد ـ چاپخانەی سەیدیان ـ ١٣٦٤ - ل ٨

١٢ و ١١ ـ پێشەکی بەدران ئەحمەد بۆ سەرچاوەی ژمارە ٣- ل ـ ٨ تا ٩

١٣ ـ خالد جووتیار ـ حەیران و مەرگی غەریبان(کۆمەڵە وتار)ـ چاپی یەکەم ـ١٩٩٠ـ ل٤٣

١٤ ـ سەرچاوەی ژمارە ٤ -ل ١٤٩

هەڵبەت وادیارە بەحری لە بەرامبەر بۆچوونی دەستەی یەکەمدا، بە ئاشکرا پشتگیری لە بۆچوونی دەستەی دووهەمیش ناکا. چونکە هەر لە درێژەی قسەکانی پێشوودا دەڵێ: «ئەسڵەن بۆ شوێنی سەرهەڵدانی حەیران لە وڵاتە پان و بەرینەکەمان دابڕین و بیخەینە ناو جەغزێکی بەر تەسکەوە؟»

١٥ ـ پێشەکی بەدران ئەحمەد بۆ سەرچاوەی ژمارە ٣

١٦ ـ ئۆمەر دزەیی ـ سەرچاوەی ژمارە ١

١٧ ـ سەرچاوەی ژمارە ٣ ـ ل ١٣

١٨ — سەرچاوەی ژمارە ٧ ـ ل ٧

١٩ ـ قادر فتاحی قاضی ـ منظومهٔ کردی لاس و خزال ـ انتشارات دانشگاه تبریز چاپ اول ـ ١٣٧٩

٢٠ ـ پێشەکی مارف خەزنەدار بۆ : عومەر شێخەڵڵا دەشتەکی ـ داستان و گۆرانی لە فۆلکلۆری کوردیدا ـ هەولێر، وزارەتی رۆشنبیری ـ ١٩٩٨ ـ ١٨٤

٢١ ـ سەرچاوەی ژمارە ـ ل ٣ ـ ٧١

٢٢ـ گۆڤاری سروە ـ ژمارە ١٠

٢٣ ـ سەرچاوەی ژمارە ٤ ـ ل ٢٩٣

٢٤ ـ سجاد آیدنلو ـ شاهنامه و ادب عامیانه کردی ـ ارومیه ـ انتشارات صلاح‌الدین ایوبی ـ چاپ اول ـ ١٣٧٩ ـ ص ٢۴

ئەو بەیتە کوردییانەی لەم کتێبەدا کاریان لەسەرکراوە، ئەمانەن: شێخ فەرخ و خاتوون ئەستی، بارام‌وگوڵەندام، ئازیزە، سەیدەوان، شێخ مەند و شێخ رەش، کانەبی، سام سام غەزای سیسەبان، ئایشەگوڵ، زەمبیل فرۆش، سوارۆ، زەینەڵ بەگ، شۆڕمەحموود و مەرزینگان، هەمزاغا، خەزێم، وەنەوش و بەرەزا، لاس و خەزاڵ، با پیراغای مەنگوڕ، بەیتی قەبران، شەم و شەمزین، خەلیل پاشا، عوسمان پاشا. بەڵام هەموو ئەو بەیتانە بۆ بەراورد کردنیان لەگەڵ شانامە، نموونەیان لێ نە هێندراوەتەوە.

٢٥ — سەرچاوەی ژمارە ١٩

٢٦ ـ سەرچاوەی ژمارە ٤ ـ ل ٤

٢٧ ـ سەرچاوەی ژمارە ٤ ـ لل ١٤ — ١٣

٢٨ ـ عەلی خزری ـ سەرچاوەی ژمارە ١

٢٩ ـ سولێمان پیرۆتی ـ پاییزە و پایزە ـ گۆڤاری سروە ـ ژمارەی ١٠٠ — ٩٩ ل ٤٢

٣٠ ـ سەرچاوەی ژمارە ٤ ـ ل ٦١

له دوایین بەشی فەسڵی پێشوودا گوتمان وا هەبووە کەسانێك، هێندەك بەیتیان لەسەرڕاوە بە شێوەی شێعر، یان شانۆ، یان چیرۆك و ڕۆمان داڕشتبێتەوە. با نەختێك لەکرداری «داڕشتنەوە» ورد بینەوە. مانایەکی لاوەکی ئەوم گوتەیە ئەوەیە کە بەیت چوارچێوەیەکی جیاواز لە فۆرمی گشت ئەو بابەتانەی هەیە. ئەگینا پێویستی بە داڕشتنەوە نەدەبوو. واتە کۆمەڵەی دەقەکانیبەیتی، سەرەڕای هەموو جیاوازییەکانیانەوە، خاوەنی چوارچێوەیەکی تایبەت، بە یاساو ڕێسای تایبەتی خۆیانن.

لەتیۆری ئەدەبدا، بوونی چوارچێوە و یاسا و ڕێسایەکی تایبەت، بۆ کۆمەڵێکدەقی ئەدەبی،دەسبەجێچەمکێکمان وەبیردەخاتەوە: ژانری ئەدەبی.

بەیت بە تەنیا چیرۆك نیە. چونکە سەرەڕای ئەوەی خاوەنی زۆریەك لە تایبەتمەندییەکانی چیرۆکە، ڕەگەزی زۆر بە هێزی دراماشی تێدا بەدی دەکرێ. هەر بە تەنیا چیرۆکێکی دراماییش نیە، چونکە ڕەگەزی زۆر بەهێزی شێعری تیدا بەدی دەکرێ. کەواتە چوارچێوەی گشتی بەیت بە دار و پەردووی سێ ژانری تری چیرۆك و دراماو شێعر، پێکهاتووە.

ئەگەر بەو قەناعەتە بگەین کە لە بەستێنی ئەدەبی کوردیدا،«بەیت» خاوەنی کۆمەڵە ڕێسایەکی تایبەت بە خۆیەتی، یەکەورێ ئەرکی هەڵێنجان و

رێکوپێککردنی ئەو ڕێسایانە، لەئاستی لێکۆڵینەوەکانی ئەدەبیماندا خۆیا دەبێ. ئەم چەشنە توێژینەوەیەش لە بەستێنی موتاڵاکانی بەیتناسیدا دەکەوێتە خانەی لێکۆڵینەوەی پێکهاتە خوازانەوە.

ئەو کەسانەی کاری لێکدانەوە و شی کردنەوەی مانای بەیتێکیان کردووە، کارەکەیان دەکەوێتە خانەیەکی غەیری خانەی کۆکردنەوەی ڕێساکانی ئەو ژانرە. واتە هەموو جارێ ڕاڤەیەکی تایبەت سەبارەت بە بەیتێك بەدەستەوە دراوە، بەلام بەیت بە مانا گشتییەکەی خۆی نەخراوەتە ناو چوار چێوەی یاساکانی بەر بلاوی «بووتیقا» یان تێوری ئەدەب.

تزوتان تۆدۆرف دەڵێ:

**«لە بەرامبەر کەسێکدا کە «ڕیساکانی حەکایەت» دەنووسێتەوە، چەند کەسی ڕاڤەکار هەن کە مانای ئەم یا ئەو حەکایەتەمان بۆ شیدەکەنەوە. تایبەتمەندی بەرچاوی مێژووی توێژینەوەکانی ئەدەبی، بریتییە لە ناهاوسەنگی و قورسبوونی تای تەرازووی ئەو توێژینەوانە، بە سوودی ڕاڤە. هەڵبەت نابێ لەگەڵ ئەسڵی ڕاڤە بەریەرەکانی بکرێ، بەلکوو دەبێ ئەو ناهاوسەنگییە لابچێ.»[1]**

یەکێك لەکۆنترین دابەشکردنەکانی ژانرگەلیئەدەبی، هیئەفلاتوونە کە پێیوایە هەموو بەرهەمە ئەدەبییەکان، لە سێ ژانری حیماسە و شێعر و درامدا جێگایان دەبێتەوە.دواتر لەدەرەوەی ئەو پۆلێنکردنە چەقبەستووەدا، هێندەك پێوانەیتر بۆ لێك هەلاواردنی ژانرەکان بەدەستەوە دراون.

«نۆر ترۆپ فرای» پێوانەیەك، بە گوێرەی چۆنیەتی پێوەندی نێوان قارەمانی داستان لەگەڵ دوو عونسوری خوێنەر و یاساکانی سروشت دەسنیشان دەکا:

١ـ ئەگەر لە دەقێکدا، قارەمان لەسەرووی خوێنەر و یاساکانی سروشت بێ، ئوستوورە پێك دێ.

٢ـ ئەگەر سەرەوری قارەمان ڕابگیرێ بەلام مەرجی هەبێ واتە لە چوارچێوەی یاسایەکی تایبەتیدابێ حەکایەتی فۆلکلۆری پێك دێ.

٣ـ ئەگەر قارەمان باڵادەستی خوێنەر بێ، بەڵام ژێردەستی یاساکانی سروشت بێ، لەگەڵ «ژانرێکی لاسایی کەرەوانەی بەرزتر» بەرەورووین.

٤ ـ ئەو کاتەی قارەمان، وێڕای خوێنەر و یاساکانی سروشت، لە ئاستێکدان، لەگەڵ «ژانرێکی لاسایی کەرەوانەی نزمتر» بەرەورووین

٥ ـ ئەو کاتەی قارەمان لە ئاستێکی نزمتر لە ئاستی خوێنەردا راوەستاوە، «گاڵتەیەکی قەشمەرکارانە» پێکدێ.[٢]

وەك دەبینین ئەو دابەشکردنەش، چەند سنوورێکی یەکجارەکیمان بۆ دەسنیشان دەکا و بە شێوەیەك لە شێوەکان دەست و پلمان بۆ کاری توێژینەوەی ئەدەبی دەبەستێتەوە.

مێژووی باسوخواسەکانی پێوەندیدار بە بابەتی«ژانر»، رووی لەدەسنیشان نەکرانی یەکجارەکی سنووری ژانرەکان دابووە.بووچوونەکانی«تۆدۆرۆف»، بە تەواوی بۆ دۆزینەوەی چوارچێوە و رێساکانی ژانرێکی غەیری ئەوانەی ناسراون و ناسێندراون، دەستمان ئاوەڵا دێڵنەوە.تۆدۆرۆف، دوای رەخنەگرتن لە پۆلێن کردنی«فرای»و رەتکردنەوەی، باس لەدووکۆمەڵە ژانری تیۆری ومێژوویی دەکا. بناغەی ژانرێکی تیۆری، لە سەر تیۆرییەکانی گشتی ئەدەبی، دادەرێژرێ. بەڵام ژانرێکی مێژوویی لەئاکامی ورد بوونەوە لە راستییەکانی بەرچاوی بەرهەمە ئەدەبییەکانی بەردەست، شەقڵ دەگرێ. لە هەر دووك کۆمەڵە ژانری تیۆری و مێژووییدا، کاتێك سنووری ژانرێکمان دەسنیشان کرد، بۆ دڵنیا بوون لە دروستی ئەو سنوورانە، دەبی دوو پرۆسەی جیاوازی تاقیکاری دەکار بکرێ: پێناسەی ژانرێکی تیۆری دەبی بە هۆی دەقەکانی ئەدەبی بەردەستەوە، تاقی بکرێتەوەو دووبارە بنووسرێتەوە. ژانرەکانی وەرگیراو لە مێژووی ئەدەبیش، دەبی بەهۆی تیۆرییەکانی گشتی ئەدەبییەوە تاقی بکرێنەوە. بەم حاڵەشەوە ناکرێ پێناسە و یاسایەکی یەکجارەکیوگشتیویبێ‌تەملاوئەولا، بۆژانرێکی تایبەت دیاری بکرێ.[٣]

لەم لێکۆڵینەوەی بەردەستمان دا، بەیت وەکوو ژانرێکی مێـــــــژوویی چاوی‌لێکراوە. واتە هەوڵی ئەوە دراوە، لە ناو کۆمەڵە دەقێك دا کە بە «بەیت» ناسراون، تێبگەڕێین و چوارچێوە و تەوەرەی هاوبەشیان و رەوت و رێسای دووپات بوویان بدۆزینەوە. لەپێشدا با بزانین رەگەزەکانی چیرۆك و شێعر و دراما، چۆن رەنگی ئامادەبوونیان لە دەقی بەیت دەدەن و لەئاستی یەکەمدا بەجیا و لەئاستی دووهەمدا بەتێکەڵ بوونیان، پێکهاتەی بەیت دەنەخشێنن.

## ڕەگەزەکانی چیرۆک

### ١ـ گوزارە، زنجیرە*، دەق

گرینگترین سەرقالیی ڕەخنەگرانی پێکهاتەخواز، بۆ شیکردنەوەی دەقێکی داستانی، بریتی بووە لەدۆزینەوەی یەکەکانی گێڕانەوە** لە ناو دەقدا. ئەو ڕەخنەگرانە، سێ یەکەیان بە ناوی گوزارە، زنجیرە و دەق دەسنیشان کردووە.

گوزارە لە شکاندن و دابەشکردنی«مۆتیف»[٤] دروست دەبێ. بۆنموونە «ویلادمیر پراپ» مۆتیفی «ئەژدیها، کچی پادشا دەدزێ»، بە پێی ڕێسایەکی داهێنراوی خۆی دەشکێنێ و دەیکا بە چەند گوزارەی جیاواز. پراپ ڕێساکە لەسەر بناغەی گۆڕان یان نەگۆڕانی کەسەکان یان ڕووداوەکان لەناو حەکایەتە فۆلکلۆرییەکانی جۆراوجۆردا، هەڵدەچنێ. لە مۆتیفی دزرانی کچی پادشا لەلایەن ئەژدیهاوە، ئەژدیها لە حەکایەتە جۆراوجۆرەکاندا دەگۆڕێ و لەوانەیە بوونەوەرێکی‌تر، جێگای بگرێتەوە.کچی پادشاش وا هەیە بە کەسێکی دیکەوە جێگۆڕکێی پێبکرێ بەڵام «دزین» لە ناو هەموو حەکایەتەکاندا دیاردەیەکی نەگۆڕە. کە واتە پراپ گوزارەگان بەم چەشنە فۆرمۆلبەندی دەکا:

**گوزارەی یەک:** «ئەلف» کچێکی جحێڵە

**گوزارەی دوو :** «ب» پادشایە

**گوزارەی سێ :** «ب» باوکی «ئەلف»ە

**گوزارەی چوار :** «پ» ئەژدیهایە

---

* sequence پی رفت

** narration units واحدهای‌روایت

**گوزارەی پێنج: «پ»،«ئەلف» دەدرێ ***

لە بەیتی لاس و خەزاڵدا، خانزادی کچی مەحموود ئاغا، لەسەر لانکێ لە ئامۆزای خۆی واتە لاس کوڕی ئەحمەد ئاغا، مارە دەکرێ. لە بەیتی شۆڕ مەحموود و مەرزنیگانیش‌دا، مەرزنیگانی کچی مامەرەش لە ئامۆزای خۆی واتە شۆڕمەحموودی کوڕی جانگیربەگ مارەکراوە. لەو دوو نموونە وێکچووەدا، گوزارەکان بەم چەشنە لێك هەڵاوردە دەکرێن:

«ئەلف» کچێکی ساوایە

«ب» کوڕێکی ساوایە

«پ» باوکی «ئەلف»ە

«ت» باوکی «ب» یە

«پ» و «ت» پێکەوە بران

«ئەلف» لە«ب» مارەدەکرێ

زنجیرە، بریتی‌یە لە شێوەیەکی تایبەتی بۆ تێکەڵبوون و یەکگرتنی گوزارەکان. زنجیرە، بەلانی زۆرەوە لە پێنج گوزارە یان پێنج دەستە گوزارە پێك دێ. لەڕووداوێکی تایبەتدا گوزارەیەك کە دەربڕی چەشنێك هاوسەنگی (تعادل)بێ، گوزارەی سەرەتایی زنجیرەیە. گوزارە یان دەستە گوزارەی دووهەمی زنجیرە، دەربڕی حالەتی تێپەڕین لەهاوسەنگی‌را بۆ ناهاوسەنگی‌یە. گوزارە یان دەستە گوزارەی سێهەم، بارودۆخی ناهاوسەنگ دەردەبڕێ. گوزارەی چوارەم، دۆخی تێپەڕین لە ناهاوسەنگی را بۆ هاوسەنگی نیشان دەدا و لە کۆتایی‌دا گوزارە یان دەستە گوزارەی پێنجەم، بارودۆخی هاوسەنگییەکی تەواو یان ناتەواوی دوایی زنجیرە دەردەبڕێ.[٦] کەواتە زنجیرە بریتی‌یە لەمەودای نێوان هاوسەنگییەکی نزیك لە تێکچوون و شێوان هەتا هاوسەنگییەکی تەواو یان

ناتەواوی دوایی. ئەم هاوسەنگییەی دوایە، ڕەنگە خۆی ببێ بە هاوسەنگیی سەرەتای زنجیرەیەکی‌تر.

دەقیش بریتی‌یە لەڕێکخرانی چەند زنجیرەی پێڕەندیدار بەیەکەوە، بەمەرجێك بكرێ تێكڕا وەكوو چیرۆكێك چاویان لێ بكرێ.

وا هەیە دەستەیەك لەو پێنج دەستەگوزارەی پێكهێنەری زنجیرە، لەناو دەقدا نەبێ و واش هەیە دەستەگوزارەیەك خۆی ببێ بەزنجیرەیەكی سەربەخۆ.

نموونەی زنجیرە لە بەیتی لاس و خەزاڵدا:

**گوزارەی یەکەم ـ هاوسەنگی سەرەتا.**

ئەحمەد ئاغا چوار ساڵ بوو شەمێی هێنا بوو

**گوزارەی دووەم ـ تێپەڕین لە هاوسەنگییەوە بۆ ناهاوسەنگی.**

ئەو بەشە لەناو دەقدا نیە

**دەستەگوزارەی سێهەم ـ ناهاوسەنگی**

ئەحمەد ئاغا ئیلاقەی شەمێی نەدەکرد، کوتی:بۆچی ئیلاقەی من ناکەی؟

کوتی: هەتتا بۆخۆت بە دەستی خۆت‌دۆخینم نەکەیەوە ....

**دەستە گوزارەی چوارەم ـ تێپەڕین لە ناهاوسەنگییەوە بۆ هاوسەنگی.**

زنجیرەیەکی سەر بەخۆیە:

«ئەحمد ئاغا، سەر و بەرگی پۆشی، چووە زگ شێری یاغی .... خوڵا فرسەتی ئەحمەد ئاغایدا شێری خست. هەڵاتە سەری، سەری بڕی ماندوو بوو لەسەر پشتی شێرەکەی نوست... لەخەڵقی بوو بەشین و گریان کوتیان شێر ئەحمەد ئاغای کوشت. ژنەکەی کوتی ئەمن دەچم ... ژن دەستی دا خەنجەرێ، چووە زگ شێری ئەگەر چوو تەماشای کرد شێر کەوتبوو، ئەحمەد ئاغا لە سەری درێژ ببوو .. کوتی خوڵاکەی ئیلاقەی من ناکا بزانم پیاوە یان پیاو نیە... ئەحمەد ئاغا چاوی هەڵێنا تەماشای کرد ژنەکەی دۆخینی دەکردەوە»

دەستە گۆزارەی پێنجەم ـ هاوسەنگی دوایی.

«هەڵاتە سەری ئینجا لاس لە سەر پشتی شێری گووراوە. هەڵستان هاتنەوەماڵێ»[٧]

دەبینین لەو زنجیرەیەدا، دەکرێ بۆ دەستە گوزارەی چوارەم، کە بۆخوی زنجیرەیەکی سەربەخۆیە و داگری یاخیبوونی شێرە، لە سەرڕاوە ئەو پێنج دەستە گوزارەیە بدۆزینەوە.

نموونەی زنجیرە و دەق لە بەیتی زەمبیل فرۆشدا.

بە پێی نوسخەیەکی تایبەت لەبەیتی زەمبیل فرۆش دەتوانین تەواوی دەقی ئەو بەیتە بکەین بە دوو زنجیرە.

**زنجیرەی یەکەم** - دەستە گوزارەی یەکەم - هاو سەنگی سەرەتا.

زەمبیل فرۆش کوڕی میرانە

لاوکۆ بەژن رێحانە

خودانی کوچک و دیوانە

ل کەیف و سەیران، شەڤ و رۆژ

شەڤ و رۆژ کەیف خۆشی‌یە

ب عیشق و رەقس و شاهی‌یە

**دەستە گوزارەی دووەم** - تێپەڕین لە هاوسەنگییەوە بۆ ناهاوسەنگی

شەڤەکی شەڤێ لەبنی بوو

خەونەک عەجایب دیتیبوو

لناڤ خەوێدا کریبوو

دل و هەناڤ لێ هاتنە جۆش

( لە ناو خەونەکەدا پێی دەڵێن:)

هەرە ل دنێ ببە دەروێش

نەهێلە قەت رۆژی و نڤێژ

ببە فەقیرەک خەرقە پۆش

**دەستەگوزارەی سێهەم** - دۆخی ناهاوسەنگ.

زەمبیل فرۆش کوڕێ میرە

چو بووە سەر قەبرەکێ کویرە

بیرا مرنێ هاتە بیرە

چووە مال دل تەنگ و نەخۆش

دەستەگوزارەی چوارەم. تێپەڕین لەناهاوسەنگییەوە بۆ هاوسەنگی.

چووە مال و گۆتە بابێیە

من ناڤێت مالێ دنێیە

دێیم عەودالێ خودێیە

ئەز دێ بمە سەلەفرۆش

بابی لە وەلامدا دەڵێ:

بلا بچیت خوە بکەت ژیر

دا تام بکەت حالێ فەقیر

دەستەگوزارەی پینجەمی زنجیرەی یەکەم و دەستە گوزارەی یەکەمی

زنجیرەی دووهەم ـ هاوسەنگی کۆتایی زنجیرەی یەکەم و هاوسەنگی سەرەتای زنجیرەی دووهەم.

زەمبیل فرۆش رابوو سەرێ

ماچ کری دەستێ بابێ

خاتر خواست ژ هەموو خەلکێ

ب کەیف و ب دلەکی خۆش

دەستە گوزارەی دووهەم لەزنجیرەی دووهەم ـ تێپەڕین لەهاوسەنگییەوە بۆ ناهاوسەنگی.

رابوو ل رۆژا پاشیێیە

زەمبیل ل خە هەلانیێیە

ل کۆلانا دکەت گازیێیە

کول خاتوونێ ژ دوور دیتیێیە

خاتوون ژ دوور ڤە دبینیت

حەیران و بێ هۆش دمینیت

پەردەی ل بەرخوە دهەلینیت

**دەستە گوزارەی سێهەم ـ دۆخی ناهاوسەنگ**

خاتوون دبێژیت ئەی فەقیر

وەرە رازێ ل تەختێ میر

قیامەتێ بکە ژبیر

ل دەس خوە نەکە ئەڤ رۆژا خوش

وەرە ئەی لاوێ فەقیر

رۆنێ ل سەر دۆشەکا میر

تێک ڤەدە زولفێ حەریر

ئەز پاشی دێ تەکەم وەزیر

**دەستە گوزارەی چوارەم ـ لەناو دەق دا نیە**

**دەستە گوزارەی پێنجەم ـ** هاوسەنگی دوایی و کۆتایی پێهاتنی زنجیرەی دووهەم و تەواوی دەق:

(زەمبیل فرۆش نوێژ کردن دەکاتە بیانوو و دەڵێ: )

هێژ من نڤێژ نەکرییە

مەسینە هلگرت چوو بانییە

خۆ ل سەربانێ ئاڤێتییە

ژ بەر خاتوونا نامووس فرۆش.

لەو بەیتانەدا کە لەنێوان سێ ژانری چیرۆك و دراماو شێعر، رەگەزەکانی چیرۆك تێیاندا لەوانەیتر بە هێزترە، بە هاسانی دەکرێ، یەکەکانی گێڕانەوە بەشێوەی گوزارە و زنجیرە، دیاری بکرێن.

**٢ ـ بەیت و مەنتیقی مەجازی**

باسی مەجاز و خوازە، هەر لە چوارچێوەی تەکنیکەکانی «فەننی بەیان»دا نامێننەوە.مەودای پەلهاوێژی ئەو دوو باسە ئەوەندە بەرفراوان دەبێتەوە کە

دەکرێ بڵێین هەموو لقەکانی ئەدەب، یان لەسەر بناغەی مەنتیقی مەجاز هەڵچنراون یان مەنتیقی خوازە.

«خوازە پێوەندی بە هەڵبژاردنی یەکەکانی زمانییەوە هەیە و بە مانای دەرەتاتی جێنشینیەوەمەجاز، پێوەندی بەدەرەتانی تێکەڵ کردن و هاونشینی ماکەکانی زمانی هەیە»[٨]

لە خوازەدا، بە کارهێنانی یەکەیەکی زمانی لە جیاتی یەکەیەکی‌تر مانا چڕ دەکاتەوە. بەڵام لەمەجازدا هاونشینی و تێکەڵ کردنێکی تایبەتی ئەو یەکانە مانا بەرهەم دێنێ، بەم چەشنە جیاوازی نێوان دوو دەلالەتی مەجازی و خوازەیی دەردەکەوێ.

جگە لەو سیستمە دەلالەتییەی مەجاز و خوازە دایدەمەزرێنن، لە ناو زماندا چەند سیستمی‌تری دەلالەتی هەن. «ژرار ژنێت»، سێ نیزامی دەلالەتی کە لە دەقەکاندا بە کاردەهێنرێن بەم شێوەیەی خوارەوە دەسنیشان دەکا:

١ـ نیزامی دەلالەتی زمانی

٢ـ نیزامی دەلالەتی مەجازی ـ خوازەیی

٣ـ نیزامی دەلالەتی شاعیرانە

ژنێت دەڵێ ئەو کاتەی وشەی «بادەوان» بۆ خودی بادەوانی پاپۆڕ دەلالەت دەکا، دەلالەتەکە زمانی‌یە. بەڵام ئەگەر بادەوان نیشانەی تەواوی پاپۆڕ بێ، لەگەڵ دەلالەتێکی مەجازی بەرەوڕووین. (ئەوکاتەی بەشێك لەشتێك ـ بە شێوەی تەداعی و بیرکێشەکێی بەشەکانی هاونشینی دیکە ـ نیشانەی تەواوی ئەو شتە بێ، مەجاز بەرهەم دێ.)

ئەو نیزامە نیشانەییەی بۆ ئەوە ببێ، تێیدا بادەوان لەجیاتی تەواوی پاپۆڕ بەکار بهێنرێ، نیزامێکی دەلالەتی مەجازی‌یە واتە پێوەندی هاونشینی لەو نیزامە مەجازییەدا، لە چاو نیزامەکەی پێشوو، زۆر بەهێزتر و مانادارترە.ئەگەر مەدلوولی «تەواوی پاپۆڕ» خۆی ببێ بە دالێك کە جارێکی‌تر، دەلالەت دەکا بۆ

سەر مەدلوولێکیتر - بۆ نموونە بۆ سەر مەدلوولی رزگاری مرۆڤ - دەلالەتێکی شاعیرانە بەرهەم دێ.[٩]

لەو نموونەی ژنێتدا، باسی مەجاز کراوە. هەر بەم شێوەیە دەکرێ باسی خوازەش بکەین. لەو بەیتە شێعرەی وەفاییدا:

لەو شارە خەدەنگی سەنەمێکم لە جگەردا

شۆخێکە غەمـــی ئایینە داری بە قەمەردا

ئەگەر وشەی سەنەم، بە مانای خودی سەنەم بێ، دەلالەتەکە زمانییە. ئەگەر سەنەم دەلالەت بکا بۆسەر «یار»، دەلالەتێکی خوازەیی پێك دێ. لەوانەیە کەسێك لەسەر ئەو بڕوایە بێ ئەو مەدلوولەی، وشەی سەنەم دەلالەتی پێ دەکا، خۆی دەتوانێ ببێ بە دالێك کە دەلالەت دەکا بۆ سەر مەدلوولی«ئادابی تەریقەت». ئەگەر وابێ، ئەو دەلالەتەی دوایی دەلالەتێکی شاعیرانەیە.

رۆمەن یاکوبسن دەڵێ: ئوستوورە و حیماسە لە سەر بناغەی مەجاز دامەزراون و شێعری لیریکیرووسی،خاوەنی مەنتیقێکی خوازەیییە.شانتل لەسەرئەسڵی خوازە پێك هاتووە و سینەما لە سەر مەجاز دامەزراوە. یاکوبسن ئەوەش بە قسەکانییەوە زیاد دەکا کە رۆمانی نوێ کە رەگەزی دەگاتەوە سەمبۆلیسم و کاردانەوەیەکە لە بەرامبەر ریالیسمدا، دەبێ خوازەیی بێ و رۆمانی ریالیستیش بەستراوەتەوە بە مەجاز.[١٠]

چۆنیەتی پێوەندی «بەیت» لەگەڵ مەجاز و خوازە، دەروازەی ئاسویەکی نوێمان بۆ دەخاتە سەر پشت. لەبارەی ئەو چۆنیەتییەدا، با ئەو پرسیارە بێنینە گۆڕێ: ئایا بەیت، مەنتیقی مەجازی بەسەردا زاڵە یان مەنتیقی خوازەیی؟

راستییەکەی ئەوەیە کە گرانایی بەیت لەسەر گێڕانەوەیە. واتە درێژ بوونەوەی بەیتە بە ناوبانگەکان، هۆی ئەوەیە کە زنجیرەی گێڕانەوە، دەیەوێ بەپێکەوە لکاندنی ئاڵقەکانی پێکهێنەری خۆی، چیرۆکێك تەواو بکا. رەگەزەکانی شێعر و

دراماش لەناو بەیتدا، لەخزمەتی گێڕانەوەدان.کە واتە بەیت لە سەر مەجاز دامەزراوە و مەنتیقی بەیت، مەنتیقێکی مەجازی ـ یە.

هاونشینی ماکەکانی زمانی و یەکەکانی گێڕانەوە، لە بەیتی کوردیدا خاوەنی ڕێسایەکی تایبەتە. هاونشینی ماکەکان، لەزۆربەی بەیتەکاندا بەم چەشنەی خوارەوە، خۆیا دەبێ:

نزاو پاڕانەوە + گێڕانەوە + ڕۆڕۆ

ئەو هاونشینییە، وا هەیە لە سێ دێڕی بەرودوای* بەیتێکدا بکەوێتە بەرچاو و لەوانەیە لە بەندێکدا وەراست گەڕێ و واش هەیە لە سەرجەمی دەقی بەیتێکدا بڵاو بێتەوە. نموونەی ئەو هاونشینییە لە سێ دێڕی بەیتی دمدمدا:

نزا : بانگم وەبەر پادشای قودرەتێ

گێڕانەوە : خانیان شەهید کرد بە کوتکی خێوەتێ

ڕۆڕۆ : هاوار و ڕۆڕۆ دمدمە[11]

نمونە لە بەندێکی سەیدەواندا:

ڕەبی خودایە لەتۆ هەوری ڕەحمەتێ بێنی

نزا و پاڕانەوە : لە لای قوبڵەی مبارەک، لەداوێنی فەرەنگیان

لە سەر قەبری سەیدی خدری حەوت ڕەنگی

گێڕانەوە: ئەمن زەینی خۆم دەداوە تیلەگی دەکوێستانێ

لێی دەرسقا هەڵاڵە و بەیبوون، سوێسنە

دەگەڵ گوڵی دەنێرگزێ

ڕۆڕۆ: تو خوا خزمینە کێ دیویەتی لەدەورەتی زەمانەیدا

باب بەدەستی خۆی کوری خۆی بکوژێ[12]

---

* consecutive متوالی

لەو نوسخەیەی سەیدەواندا لە بەندەکانی سەرەتادا ئالقەی نزا و پاڕانەوە، دێتە بەرچاو بەڵام هەتا زیاتر لەبەندەکانی کۆتایی نزیك دەبینەوە، تۆخ‌تر بوونی ئالقەی رۆڕۆ و مەیدان چۆڵکردنی ئالقەی نزا، زۆرتر بەرچاو دەکەوێ:

گێڕانەوە: وەرە نێوچیرەوانم مرد دەنگم نەکرد

مەلکەوانم مرد هەر شوکری خودام کرد

بە خوای سەیدەوانە رۆڵە خۆڵی گەرمێنێ و کوێستانێت

وەسەر عەبدولعەزیزی دەکرد

رۆڕۆ : ئەیرۆ ئەرێ رۆڵە بابەکەی بابم کاکە سەیدەوانم رۆ

هەتا ئەوێ رۆژێ خودا لەمن دەکاتەوە دیوانێ

وەسەری عەبدولعەزیزیم دەکردەوە خۆڵی کۆکۆ[۱۳]

لەو بەندەدا دەبینین تەنانەت ئالقەی گێڕانەوەش، رەنگی شین و وایلۆکی بەخۆوە گرتووە.

بەیتی دمدم[*]، بە سێزدە بانگ کە ئاراستەی خوا و پێغەمبەر و پیاوچاکان دەکرێ دەست پێدەکا. ئەو بانگانە، هەموویان لەناو ئالقەی نزادا جێگیر دەبن. ئینجا گێڕانەوە دەست پێدەکا و لە دواییدا بە پازدە «هاوار» و «رۆڕۆ» و «کوانێ» و «کێ بوو» بەیت کۆتایی پێدێ:

نزا: بانگێکم وەبەر خوڵای، ئەوی دیکەم بەر پێغەمبەری ئاخر زەمانێ

بانگی دیم وەبەر چاکی گەرمێنێ و لەکوێستانێ

بانگی دیکەم وەبەر پیر سولەمانی لە بانێ

بانگی دیکەم وەبەر سوڵتان سەمەدی ماڵە خۆی دکرد لە دەشتێ ورمێ دەگەڵ کەونە لاجانێ[۱۴]

دوای ئەوەی چۆنیەتی تراژێدی داگیرکرانی قەڵا دەگێڕدرێتەوە، واتە ماکی گێڕانەوە ئالقەی خۆی پێك دێنێ، رۆڕۆ بەم چەشنە دەست پێ دەکا:

---

[*] نوسخەی ئۆسکارمان

کوانێ سواری دەنازەنین
کێ بوو لە ئاڵی ئادەمان
قەڵاتی هەڵگرت بەزەمان
کێ بوو لەئاڵی ئادەمانە
قەڵاتی هەڵگرت بەزەمانە
شەهیدیان کرد کاک ئاڵییە
هاوار و ڕۆڕۆ دمدمە
ئەی دمدمی بەردی دەلان
جێگەی خان و خان ئاودەلان
ئێستا بووی بە مەسکەنی خەرتەلان[١٥]

لێرەدا پێویستە روون کردنەوەیەکمان لە بارەی ئاڵقەی نزا دا هەبێ. نزا هەر بەتەنیا بریتی نیە لە پارانەوە لەخودا و هاوار بردنە بەر پیاوچاکان. لە هێندەك بەیتدا، خۆزگە خواستنێکی عەودالآنە بۆ گەیشتن بە یار، لەخانەی نزادا جێگیر دەبێ. ئاڵقەی نزا جگە لەو خۆزگە خواستنە، دیسان مەبەست و بابەتی تریش دادەگرێ. با هەر لێرەدا قەراردادێك لەگەڵ خوێنەر بکەین و روونی - بکەینەوە کە کامەبابەت بخەینە ناو خانەی نزاوە. ئەو بابەتانەی خوارەوە کە نەگێڕانەوەیەکی تایبەتیان تێدایە و نە شین و ڕۆڕۆشیان تێدا دەکەوێتە بەرچاو، سەر بە ئاڵقەی نزان:

ئەلف : پارانەوە لەخوا و هاوار بردنە بەر پیاوچاکان
ب: خۆزگە خواستنی ئەویندارانە
پ: گازیکردنی یار. واتە لە بەرچاو حازرکردنی یاری نەدیار و پێهەلگوتنی
ت : عەرزی حاڵ

نموونەی نزا بەشێوەی خۆزگە خواستن:

[ لاس دەڵێ:]

بریا دارێک بوومایە لە داری دە قەیسی یان
بیاندامایە چەنگ وەستایان، شەقیان کێشابامایە بە مشاریان
بیاندامایە بەر دەمی رەندە و کوشتەرییان
بێرێکی زۆر موسڵمان، ئەمنی لەو عێلاتەی دزیبا
بە دیاری و سەوقاتی بردبامی بۆ یای خەزاڵی مەلانەبی یان[16]

دەجا براینە برادەرینە، بریا ئەمن گوڵێک بام لەگوڵی کەس نەناسی
رەخسا بام لەنەویان، لەکەویان، لەقووچەکەی بڵباسی
دەڵێم بریا شتڵە رێحانێک بام لە سەر هەیوانی ماڵە بابی نازدار حەیرانێ
هەموو ئێوارە و سبحەینانی ئاوی ئیستکانی دەبن کردبام
سەری هەڵپساندبام بیدابامەوە لەتەنکەی دەرووەتی[17]

نموونەی نزا بەشێوەی گازی کردنی یار:

ئەمن دەڵێم ئەورۆ کێژۆڵی ئەسمەرێ لە کوێت گازگەمێ
دەوەرە کێژۆڵێ ئەسمەرێ، ئەرێ چاوەکانم سەری خۆتم لەبۆ بڵند کە
گەردەنت زەردە دەبا خاڵێ بێنەدەرێ[18].

نموونەی نزا بە شێوەی عەرزی حاڵ.

وەرەبرا، ئەوە دەڵێ برادەرینە سەرێکە من دێشێ
دڵی من بە گازە گازە
..............................
دەوەرە براینە، ئاوا دەڵێ براینە لە خۆم غەریب و دڵ بە گەرداوە[19]

جگە لەو چوار حاڵەتە، بۆ ئاڵقەی نزا، بە داهێنان و وردبینی خۆمان دەتوانین نموونەی پەرژ و بڵاوی دیکەش بدۆزینەوە. بۆ وێنە هەموو ئەو گوتانەی بە شێوەی رستەی دوعایی دەردەبڕدرێن (وەکوو: هەك نەمێنم مامزی دایکی دووکاران)، سەر بە ئاڵقەی نزان.

با بگەڕێینەوە سەر شێوەی هاونشینی یەکەکانی پێکهێنەری دەقی بەیت واتە (نزا + گێرانەواە + ڕۆرۆ). لەهێندەك بەیتدا، ئاڵقەی یەکەمی زنجیرەی هاونشینی واتە ئاڵقەی نزا، دەقرتێندرێ. لە هێندەك بەیتێشدا، دەدیترێ کە ئاڵقەی ڕۆرۆ لە کۆتایی زنجیرەکە دەگوێزرێتەوە بۆ بەشەکانیتری زنجیرەی هاونشینی بەڵام زۆرکەم وامەیە ڕەنگی تۆخی ترازێدی لەبەیت بسڕدرێتەوە.لە بەیتی «شۆڕمەحموود و مەرزنیگان*»دا شین و ڕۆرۆ، لە سەرەتای بەیتەوە دەستپێدەکا و هەتاکۆتایی بەیت درێژ دەبێتەوە و دوای خنکانی شۆڕمەحموود و مەرزنیگان، دەگا بەو پەڕی خۆی. لە سەرەتاکانی ئەو بەیتەدا، شین و ڕۆرۆ، بە دووپات بوونەوەی ئەو دێرەی خوارەوە دەکەوێتە بەرچاو:

لە دڵێکی من گەری چەندی لە هێشە و چەندی لە ژانە و چەندی شێواوە

لە کۆتایی بەیتدا، مەرزنیگان، بەم شێوەیە شین بۆ شۆڕمەحموود دەگێڕێ:

لە دڵی من گەڕێ چەندی لەهێشە و چەندی لە ژانە

جا ئەمن بۆ چیمە لەو زیندەگانی و ئەو ژیانە

کەسێکی دیکە لەسینگ و بەرۆکم بگێڕێ پەنجانە

هەڵبەتە مردن خۆشترە لەو ژیانە

سوار، بۆم بکەونە جلیتان و شەڕ ناخێوییە

بۆم بگێرن گەرمە شینێک ئەگەر هیچ شتێک لایەقی شۆڕمەحموود نیە[٢]

کە واتە بۆ سێ ئاڵقەی نزا، گێڕانەوە و شین و ڕۆرۆ، لە باری تەرتیبەوە، ناکرێ فۆرموڵێکی یەکجارەکی دەسنیشان بکرێ و کۆی رستەکانی ناو بەیت، هەر جار بۆ یەکێك لەو ئاڵقانە پەلداوێژن، با لە جیاتی ئەم فۆرمۆلە چاوێك بەو وێنەی لاپەڕەی دوایەدا بخشێنین:

---

* نوسخەی قادری فەتاحی قازی

تا ئێستا باسی چۆنیەتی ئامادە بوونی ڕەگەزەکانی چیرۆکمان لە ناو بەیتدا کرد. لە بەشەکانیتری ئەم فەسڵەدا، هەوڵ دەدەین باسی ئەوە بکرێ کە چۆن ریوایەت لە بەیتدا بە هۆی ئامادەبوونێکی تایبەتی ڕەگەزەکانی شێعر و دراما، بۆنوبەرامەیەکی تایبەت بەخۆیەوەدەگرێ و ڕووبەرێکی ڕەنگین لەناو ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیدا بۆ خۆی تەرخان دەکا.

## ڕەگەزەکانی شێعری

### ١ـ نەزمی فەزایی

یەکێك لەو دیاردانەی دەقێکی شێعری، لە دەقێکی ئەدەبی غەیرە شێعر هەڵداوێریٚ، جیاوازی ئەو نەزمەیە کە ژێرخانی دەقی شیعری پێك دێنیٚ و لە تیۆری ئەدەبدا بە نەزمی فەزایی ناودێر کراوە. ژوورخانی ئەو نەزمەش بە شێوەی ئارایشتێکی ڕواڵەتی خەملاو، لە کاتی بیستن یان خوێندنەوەی شێعر بەدی دەکریٚ.

لە بەرامبەر نەزمی فەزاییدا، جۆرێکی تری یەکگرتن و پێکەوەلکانی ئاڵقەکانی زنجیرەی هاونشینی کە بە «نەزمی مەنتیقی ـ کاتی» ناسراوە، بونیادی دەقی داستانی و چەشنەکانی‌تری دەقی ئەدەبی غەیرە شێعر پێکدێنیٚ. کەواتە دەکریٚ پۆلێن کردنی دەق، بە گوێرەی ئەو نەزمەی بەرهەمی دێنیٚ، بەم چەشنە نیشان بدەین:

گەرچی جۆری یەکەمی‌نەزم، بەیەك زاراوە(مەنتیقی‌کاتی)باسی‌لێوەدەکریٚ، بەڵام لە ڕاستیدا دوو لکی جیاوازی لیٚ دەبێتەوە کە دوو چەشنە پێوەندی جیاواز، لێکیان دەکاتەوە. ئەو پێوەندییەی نەزمی مەنتیقی پێك دێنیٚ پێوەندی عیللیەتە واتە بەشێکی دەق، دەبێتە عیللەتی بەشێکی‌تر. هاونشینی ئەو دوو بەشە و هەموو ئەو بەشانەی پێوەندی عیللیەتیان پێکەوە هەیە، نەزمی

مەنتیقی دەخولقێنێ. لە پاڵ ئەم چەشنە پێوەندییە پێوەندیەکیتر هەیە کە چۆنیەتیەکەی لەلایەن «کات»ەوە دیاری دەکرێ. واتە هەر بەشێکی داستان پێوەندیەکی زەمانی لەگەڵ بەشێکیتر هەیە. کۆ بوونەوەی ئەم بەشە جیاوازانە،«نەزمی زەمانی» دەخولقێنێ.

بۆ لێك هەڵاواردنی وردی ئەم دووچەمکە ـ واتە نەزمی مەنتیقی و نەزمی زەمانی ـ دەتوانین کەڵك لەجیاوازی دوو چەمکی داستان و گەڵاڵە (تەرح = plot) وەرگرین.

«فۆرستێر» ئەم دوو رستانە، بۆ نموونە دێنێتەوە:

رستەی ١: شامرد، دوایە شاژن مرد

رستەی ٢: شامرد و شاژنیش لە تاوی شامرد.

رستەی یەکەم داستانە و پێوەندیەکی زەمانی، بەشەکانی ئەو داستانە لێك دەبەستێتەوە. رستەی دووهەم، گەڵاڵەیە و پێوەندیەکی عیللی، بەشەکانی ئەو گەڵاڵەیە لێك دەبەستێتەوە[٢١].

دەقی شێعری بە پێی سروشتی سەر بەخۆ و تایبەتی خۆی، ناتوانێ ملکەچی ئەو چەشنە پێوەندییانە بێ، بگرە زاڵ بوونی ئەو پێوەندییانە بە سەر دەقێکدا، گەوهەری شیعری لە دەقەکە دەرداوێژێ.

نەزمی فەزایی بریتی‌یە لەزاڵ بوونی ئارایشتێکی تایبەتی بەشەکانی پێکهێنەری دەق (پیت، وشە، رستە، کۆپلە و بەند و... ) کە نەبە گوێرەی پێوەندی عیللیەت و نە بە گوێرەی پێوەندی کاتی پاساوی بۆ نادرێ.

ئاشناترین نموونەی زاڵ بوونی نەزمی فەزایی، لە شیعری کلاسیکدا بەدی ـ دەکرێ. لە شێعری کلاسیکدا، دوو ئەستوونی رێك لە پاڵ یەکدا رادەوەستن. نیوە بەیتەکانی تاق، ئەستوونی یەکەم پێك دێنن و نێوە بەیتەکانی جووت ئەستوونی دووهەم دروست دەکەن. ئەو جۆرە پێوەندییانە، لە شێعری نوێدا، بە شێوەی داهێنەرانەی تازەتر خۆ دەنوێنن.

ژانری بەیت، لەو جیگایانەدا کەمیوانداری شیعر و ڕەگەزەکانی شیعری دەکا بە شێوەیەکی بەرچاو جێگا بۆ نەزمی فەزایی، لە ناو خۆیدا دەکاتەوە (هەڵبەت دەکرێ بۆ نەزمی مەنتیقی‌کاتیش، نموونەی جوان و ڕێك و پێك لەناو بەیتەکاندا بدۆزێتەوە، بەلام دۆزینەوەو باسکردنلەم نموونانە، دەکەوێتە خانەی ڕەگەزەکانی چیرۆك.)

باسەرنج بدەینە دووپات بوونەوەی مۆدێلێکی تایبەتی دەربڕین لەو بەشەی بەیتی دمدمدا:

| تفەنگانت | بۆ دەشکێنم | خانی خۆم | جویّ لە | وەستاشاقوڵی‌یە |
|---|---|---|---|---|
| رمبانت | بۆ دەشکێنم | خانی خۆم | جویّ لە | نەزەری یە |
| مەتالانت | بۆ دەشکێنم | خانی خۆم | جویّ لە | کەرەگەدەنی یە |
| زرێیانت | بۆ دەپسێنم | خانی خۆم | جویّ لە | داودی یە |
| ئەسپانت | بۆ دەپسێنم | خانی خۆم | جویّ لە | سەگلاوی یە |
| پیاوانت | بۆ دەپسێنم | خانی خۆم | جویّ لە | سی ساڵی‌یە[٢٢] |

ئەو شەش رستەیە، بە هۆی پێوەندی عیللیەتەوە، لێك نابەسترێنەوە. لەباری کاتیشەوە پێوەندییەکی بەرودوای زەمانییان نیە. کەواتە ئەوچەشنە دووپات بوونەوەیە، نەعیللییەت داوای بۆ دەکا و نە پێوەندی زەمانی، بەڵکوو لە سەر بنەمای چەشنێك نەزم و ئارایشتی زمانیەوە پێك هاتووە.

لەم نموونانەدا چەشنە دەربرینێکی تایبەتی، ئەوەندە بە گۆڕینی وردەکارییەکان و پاراستنی شێوەی گشتی خۆی دووپات دەبێتەوە، هەتاکوو لەئاکامی ئەو دووپات بوونەوەیەدا مۆدێلێکی دەربڕین پێك دێ کە داگری دوو بەشی بگۆڕ و نەگۆڕە. لەلای یەك راوەستانی بەشەکانی بگۆڕ و نەگۆڕی نموونە دووپات کراوەکانی ئەو مۆدێلە، ئارایشتێکی فەزایی دەخولقێنێ:

| ئەو هەنیەم | بۆ توو | نیگاداشتی‌کردووە | هەزار و حەوسەد مەلایکەتی جلەوکێشە |
|---|---|---|---|
| ئەو برۆیانەم | بۆ توو | پەروەردەکردوون | دەبێ شاری هیندی بۆ بدەی بە دەرمان. |
| ئەو چاوانەم | بۆ توو | پەروەردە کردوون | دەڵێی ئەستێرەی گەلاوێژە.. |
| ئەوکولّمانەم | بۆ توو | پەروەردەکردوون | دەڵێی‌فانووسەلەدیوانی‌سوڵتانی‌ئەستەمبۆڵێ |
| ئەو کەپۆیەم | بۆ توو | پەروەردە کردوون | مەگەر هەر مەیاسی دانا مەعنای بزانێ |
| ئەو لێوانەم | بۆ توو | پەروەردە کردوون | پیاوی‌تاجرمەگەرکلووری‌ببێ‌دەناقیمەتی‌نازانێ |
| ئەو ددانانەم | بۆ توو | پەروەردە کردوون | هەردانێکم گەوهەرێکە... |
| ئەو چەنەی رەنگشاخی‌زێرینی | بۆتووم | پەروەردە کرد | دڵم نایە دەمست وەستای ناشی نێم... |
| ئەوگەردەنەم | بۆ توو | پەروەردە کردووە | دەڵێی شووشەی گولاوێیە |
| ئەو کەشەفەم | بۆ توو | پەروەردە کردووە | جووتێك لیمۆی کاڵی لە سەرن[٢٢] |

لەو شێوە ئارایشتەدا، تەواوی جوانکارییەکانی بەیت بە کەرەستەی سێحراوی دووپاتکردنەوە، دەرسکێن. لە فەسڵەکانی داهاتوودا باسی ئەوە دەکەین کە چۆن ئەو چەشنە دووپاتکردنەوانە، بە شێوەی داهێنەرانەی‌تریش دەکار کراون.

نموونەی دووپات بوونە لە لاوکی «گێنج خەلیل»دا:

دگۆ: هەر چل سوار هەسپێ خۆیان گرێدایە
ل تەوێل و تەوێل خانان ئالیک دانییە
ڤاوێ خۆیان برژاندییە
ڤاوێ خۆیان کەلاندییە
ڤاوێ خۆیان خواردییە
ڤەلوونێ خۆیان تێ کردییە
ڤەلوونێ خۆیان کێشاندییە
...[ حەفسەد دەڵێ:]
دڵم ناهێ وێ نەخۆشێ ل خەوێ راکەم

بەلێ وەزێ رابم و ل خەوێ راکەم
جزمەکێ تەلیعانێ ئنگرێزی ل پیاکەم
شەروالەکا عەرزە رۆمانی ل لنگاکەم
کراس و دەرپێیەکا کتانی شام ئەستەمبۆلی ل بەراکەم
حەزامەکا بە غدادلی ل پشتا کەم
خەنجەرەکی سالح بەگی ل بەر ڕاکەم
چەفیەکا حەمس و حەمایی ل سەرا کەم
عەگالەکی عورفایی ب سەر دادەم...
عەبایەکی عەورانی ل سەر ملاکەم[٢٤]

لەو بەشەی خوارەوەی بەیتی خەزێمدا، هەموو دێڕەکانی هاو ژمارە، خاوەنی یەك مودێلی دەربرینن و دووپات بوونەوەیان لە سێ بەندی بەرودوادا، ئارایشتێکی تایبەتی پێك دێنێ:

١ـ سەد وەستام دەوێ لە بانی کۆیێ
٢ـ هەشتا لە مووسلێ شێست لە شنۆیێ
٣ـ کراس بدروون لە گوڵی لیمۆیێ
٤ـ دەبلاّ تەنگ بێ
٥ـ ناسک و شلك بێ
٦ـ بۆ چاو هەڵۆیێ

١ـ سێ سەد وەستا بێن لێرە لە لاجانێ
٢ـ شێست بێن لە مووسلێ، چل لە تارانێ
٣ـ کراس بدروێ لە کوڵووکی ڕێحانێ
٤ـ دەبلاّ تەنگ بێ
٥ـ ناسک و شلك بێ
٦ـ بۆ نەشمیلانێ

١ـ سێ سەد وەستا بێ لەلای دریازێ
٢ـ شێست بێن لە مووسلێ چل لە شیرازێ

٣ـ کراس بدروێ لە گوڵی پێوازێ
٤ـ دەبلا تەنگ بێ
٥ ـ ناسک و شلک بێ
٦ـ بۆ بووکە نازێ[٢٥]

ماکەیەکیتری پێکهێنەری نەزمی فەزایی، لە کەش و هەوای شاعیرانەی بەیتدا، دووپات بوونـــەوەی ئەو دێـڕانەن کە کارێکی هاوســـەنگی کاری تەرجیعبەندەکانی شێعری کلاسیك وە ئەستو دەگرن. دووپات بوونەوەی ئەو دێڕانە، جاری وایە لە سەرەتای بەند و جاری واشە لە کۆتایی بەنددا دەکەوێتە بەرچاو.

لە بەندەکانی«پایزە»دا دێڕێك لە سەرەتا و دێڕێکیتر لە کۆتایی بەنددا بەم شێوەیە دووپات دەبێتەوە:

دێڕی سەرەتا: ئەوە سەدایەکە پیرە پایزێم گەیوەتێ.

دێڕی کۆتایی: سەرگەردان و دەست بەرداری ئەوان خەزێم شۆڕ و گوارە شۆڕانم. ئەزت مرم پایزێ.

## ٢ـ کێش و سەروا

جگە لەبابەتی نەزمی فەزایی، چەند ڕێسای تریش هەن کە ئامادە بوونی ڕەگەزەکانی شێعری لە ناو بەیتدا، تۆختر دەکەن و بریتین لە سەروای بەیتی و کێشی برگەیی. لێرەدا، زاراوەی سەروای بەیتی ـ مان بە قیاس لەگەڵ زاراوەی سەروای شێعری بەکارهێناوە. لە شێعردا، شاعیرمافی کەم کردنەوە یان زیاد ـ کردنی برگەی بۆ ڕێك کردنی سەروا نیە بەڵام لە بەیت و باودا، ڕێسایەکی ئەوتۆ دێتە بەرچاو.

بەگشتی سێ جۆری سەروای بەیتی لە دەقی بەیتەکاندا، وەبەرچاو دەکەون:

**ئەلف ـ** سەروای ئاسایی: ئەو جۆرە سەروایە، لەگەڵ سەروای شێعری هیچ جیاوازییەکی نیە:

**ئای دەلال ژارۆ! دلێ منۆ پرچەکا هەورێ ل سەر مێردینێ**
**گەلی هەوال و هۆگرا یارێ منێ مینا کەوا گۆزێ، کەوا بارێ دخوینێ**
**دگەرێ ل کویستانا، ل زۆزانا، هۆهۆ هەوارە بەرهێلینێ**
**لۆما من نەکەن، بێ لۆمەیە دەردێ عەشقێ و ئەوینێ**
**مانێ کەسێ نزانێ کا ئەوینا من خۆشترە، یان هێ مەم وزینێ**[٣٦]

ب ـ سەروای دەستکرد: ئەو جۆرە سەروایە بە زیاد کردن یان کەم کردنی برگەیەك بە وشەوە سازدەکرێ:

**ئێستا ئەمن چلۆن وەدەر بکەوم. بۆ هیچ شاران ناچێ ڕێگایە**
**وەرە مێر بمکوژە چاترە گەردنت بێ خۆش و ئازایە**
**نەوەک گورگ و جانەوەر بمخۆن لە سەحرایە**
**بەس نیە ئەگەر ئەتوو بمکووژی، ئەمەکم ناچێ بەزایە**[٣٧]

لە وشەکانی «ڕێگایە» و «ئازایە»دا، برگەی دوایی زیاد کراوە هەتا لەگەڵ«سەحرایە» و «بەزایە»ڕێك بن. لەنموونەی خوارەوەدا، لە جیاتی زیاد کردن، کەم کردنی برگە وەبەرچاو دەکەوێ:

**پایز لە خەڵکی زووە، لە منی غەریبە ماڵێ ئەوەڵی جستانێ**
**ئەوە گەلی دە دۆستانێ، گەلی دەخزمانێ، گەلی دەبرایان**
**تۆخودا، ئەورۆ، زەبنێک خۆ بدەنەوە خووسی ئەوێ پیرە پایزێ**[٣٨]

لە کۆتایی وشەی«جستانێ»دا برگەیەك قرتێندراوە ـ واتە دەبوایە جستانێیە بوایە ـ هەتا لەگەڵ وشەکانی دۆستانێ و خزمانێ ڕێك بێ. خاڵێکی سەرنج ڕاکێشی‌تر لەم بەندەدا ئەوەیە کە سەرواکان هەر بە تەنیا لەکۆتایی دێڕەکاندا نەهاتوون بەڵکوو لەناو بەنددا بڵاو بوونەتەوە.

پ: سەروای بێمانا: بریتی‌یە لە بەکارهێنانی وشەیەك وەك سەروا کە یا بێمانایە یان لەو زەمینەیەی تێیدا جێگیر کراوە، مانایەکی تایبەتی‌نیە. لەو نموونانەی خوارەوەدا، سەرنج بدەنە سەروای دێڕی یەکەم:

حەیران لێکە لێکە

کەمەرەی حەیرانێ ئەونێک ئەونێکە

دوونێ هێوارێ، گەیشتمە پلکە پێناوێ، پێم گوت: توخوا گەلە کەسەرداری

دووچاوی کارم، ئەگەر گەیبە حەیرانێ گەلە سەلامی لێکە[٣٩]

حەیران‌پێشی بە پێشی

دەچمە دەشتی قەراجێ، لێم دەدا تاوەکی بارانێ لێم دەدا لە دابێرێ مەڕی

لۆ تۆ نەمایمە لە هۆبە رەشماری پێشی[٣٠]

کێشی برگەییش لە ناو بەیتدا دیاردەیەکی نامۆنیە، شێعری نوێ، بەم پاساوە ـ راست یا ناراستە ـ لە ئەدەبی کودریدا، زەمینەی بۆ خۆش کرا، کە گەرانەوەیەکە بۆ کێشەکانی خۆماڵی بەیتی کوردی.

لە فەسڵی یەکدا کورتە باسێك لەسەر ژمارەی برگەکان لە بەندی کورت و درێژدا کرا لێرەدا دووبارەی ناکەینەوە و ئەم بەشە بە باس کردن لەو خاڵە کۆتایی پێ دێنین کە گەرچی کێشی برگەیی لە ناو بەیتدا ئامادەیە بەڵام پێکهاتەی شێعریی بەیت، زیاتر بەستراوەتەوە بە سەروا.

## ڕەگەزەکانی درامایی

بەهێزی ڕەگەزەکانی درامایی، جاری وایە لەو جێگایانەدا دەبیندرێ کە دووبابەتی ئاڵۆزکانی کات* و گێڕانەوەی گوتەکان، لە جۆمگەیەکی تایبەتدا دەگەن بەیەك و لە ڕاستیدا دەبن بەیەك بابەت.

ئاڵۆزکانی کات، بریتی‌یە لە چەند شێوەیەکی تایبەت بۆ جیا بوونەوەی زنجیرەی زەمانی حەکایەت و زەمانی دەقی حەکایەت، یان جیا بوونەوەی «کاتی جیهانی داستان» و «کاتی جیهانی دەقی داستان».

لە ڕووی یەککگرتن و یەکنەگرتنی ئەو دوو چەشنە کاتەوە، چەند حاڵەت دەکرێ ڕوویدا:

١ـ داهێڵان (تەعلیق): بەو حاڵەتە دەڵێن کە بۆ کاتی دەق لە ناو زنجیرەی کاتی داستاندا هاو چەشنێك نەدۆزرێتەوە. بەرچاوترین نموونەی ئەو پێودانگە، «وەسف»ـ ە. وەسف کە لە زەمانی دەقی داستانیدا، جێگایەکی بەرچاو داگیردەکا، لە زەمانی داستاندا، هێچ جێگایەکی نیە.

٢ـ قرتاندن( حذف): بە پێچەوانەی خاڵی پێشوو، بەحالەتێك دەڵێن کە کاتی داستان لەناو زنجیرەی کاتی دەقی داستاندا، هیچ هاو چەشنێکی بۆ نەدۆزرێتەوە. دیارە نەپێویستەو نەدەکرێ سات بە ساتی داستان، لە ناو دەقدا جێگای بۆ بکرێتەوە.

٣ـ ڕێك بوون (تطابق): بریتی‌یە لە یەك گرتنی تەواوی کاتی داستان و کاتی دەقی داستانی.[٢١]

ڕەگەزەکانی درامایی، لە برگەیەك لە برگەکانی ئەم حاڵەتەی دواییدا، هەلی خۆیا بوونیان بۆ دەڕخسێ.چونکە چەمکی حوزوور و ئامادە بوون، لەم

---

* anachronism زمان پریشی

حاڵەتەدا تێر و تۆختر پێشان دەدرێ.بەڵام روودانی ئەم شێوە یەکگرتنە مەرجێکی تایبەتی دەخوازێ کە قسەکردن لەم مەرجە دەکەوێتە خانەی بابەتی شێوازی گێرانەوەی گوتەکان.

لە گێرانەوە دا، بە گشتی یان رووداوێکی قسەیی(کەلامی) دەگێردرێتەوە، یان رووداوێکی غەیرە قسەیی. گێرانەوەی رووداوی قسەیی، لە باری وردەکاری و دیققەتی گێڕانەوەوە، ئەم ئاستانەی خوارەوە دادەگرێ:[٣٢]

**ئەلف ـ شێوازی راستەوخۆ**: لەم شێوازەدا، قسەیەك دەقاودەق وەك خۆی دەگێردرێتەوە. وەك ئەم رستەیە: هەواڵەکەم گوتی من دەچم بۆ کوێستان.

**ب ـ شێوازی ناراستەوخۆ**: لەم شێوەیەدا قسە بێژ، قسەکە وەك خۆی دەگێڕێتەوە و ناواخنەکەی ناگۆڕێ بەڵام لە رووی رێزمانیەوە، ئاڵ و گوڕ بە سەر رستەکاندا دێنێ: «هەواڵەکەم گوتی ئەو دەچێ بۆ کوێستان»

**پ ـ شێوازی وتەی ئاگادار کەرەوە**[٣٣]:لەم شێوە گێڕانەوەیەدا، قسەیەکی دوور و درێژ، زۆر بە کورتی و بەگشتی، بە بێ ئەوەی ئەسڵی رستەکان باسیان لێ‌بکرێ، لە رستـــەیەکی‌تردا کە لەخۆگری ئامانجی دوایی قســـەکەیە، دەگێردرێتەوە. وەکوو: «من دایکم سەبارەت بە بریارم بۆ زەماوەند لەگەڵ هێرۆ ئاگادار کردەوە»

ئێستا با بگەڕێینەوە سەر باسی یەکگرتن و یەکنەگرتنی کاتی داستان و کاتی دەقی داستانی. رێك بوونی ئەو دووکاتە، بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ، ناتوانێ بەردەوام بێ. یەکێك لە مەرجەکانی بەردەوام بوونەکەشی ئەوەیە کە گرانایی سەرەکی گێڕانەوە بکەوێتە سەرشانی شێوازی گێڕانەوەی راستەوخۆی قسەکان. بەم چەشنە لەگەڵ ئامادە بوونێکی بەرچاوتری کەسایەتییەکان لە ناو دەقدا بەرەوروو دەبینەوە کە زەمینەی وەرگرتنی دەق وەکوو دەقێکی داگری رەگەزەکانی درامایی خۆش دەکا.

لە بەیتدا داكۆكیەكی زۆر بۆ بەكارهێنانی شێوازی گێڕانەوەی ڕاستەوخۆ بەدی دەكرێ، ئەم داكۆكییە، بە دوو شێوە وەبەرچاو دەكەوێ:

**ئەلف: لەرووی چەندایەتییەوە**

**ب: لەرووی چۆنیەتییەوە**

لەرووی چەندایەتییەوە، زۆرترین كەڵك لە شێوازی گێڕانەوەی ڕاستەوخۆ لەچاو شێوازەكانی‌تری گێڕانەوەی قسە و هەروەها لەچاو گێڕانەوەی ڕووداوەكانی غەیرە قسەیی وەرگیراوە. بەیتی ئەوتۆ هەیە زۆر زیاتر لە نیوەی ڕوویەری دەقی بەیتەكە، بۆ ئەو شێوە دیالۆگ و مۆنۆلۆگە ڕاستەوخۆیە تەرخان‌كراوە. هەڵبەت تا ڕادەیەكی كەمیش، كەڵك لەو دوو شێوازەی تر وەرگیراوە.

نموونە بۆ شێوازی ڕاستەوخۆ: ( شێخ فەرخ و خاتوون ئەستێ ):

نازدار دەڵێ: بابە چبكەم مندالێكە بە نادری

هەرچەند دەكەی مەمكی چ كافر و موسڵمانی ناگری

مام غەلیفە دەڵێ: فرزەندی من گیانە

وەرن تەگبیری بكەین بە هەمووانە

بەخێو بكەین فەرخۆڵەی بەستەزمانە

ڕۆڵە نازدار ئەگەر بۆم بەخێو بكەی لەو دنیایە شاری دوادیەی بەشی خۆمت دەدەمێ گەردنت دەكەم ئازایە....

(نازدار) دەڵێ: بابە بۆ لەمن دەكەی فكرێ

بابە لێم لە بیانووی چونكە نانت گەلێك دەخورێ

بابە ئەگەر بچمە كوڵانان نان نانەم پێ پەیدا دەكرێ

ئەمن مێردم نەكردووە ئەو شەیتان و ڕموزنەم پێ بەخێو ناكرێ[٣٤]

نموونە بۆ شێوازی ناڕاستە و خۆ (بەیتی دمدم)

جواب چوو لە بۆ خانیە

چاكە خۆی بكا قەویە ( لە جیاتی: چاكە خۆت بكەی قەوی‌یە)

عالەم بۆ ئەو بزووتیيە الە جیاتی عالەم بۆ تۆ بزووتیيە!
چاک شەڕێک لە سەر دینيیە [٣٥]

نموونە بۆ قسەی ئاگادارکەرەوە(دێڕی دوایی لەم بەندەی دمدمدا)

بۆ ڕۆژی ئاخر زەمانی
دمدمم بەردی لەنزاری
لێیاندا تۆپی هەوشاری
حەوت شەو و ڕۆژان ئاوباری
دونیای داگرت بە یەکجاری
خەبەر چوو بۆ هەوشاری [٣٦]

لە ڕووی چۆنیەتییەوە، بۆ جەخت کردن لە سەر گرینگی شێوازی گێڕانەوەی ڕاستەوخۆ لە دەقی بەیتیدا، دەست پێکردنی قسەی کەسایەتییەکانی ناو بەیت، زۆرجار هاوکاتە لەگەڵ گۆڕانی بەشی تەخت بۆبەشی بەند یان بەشی پەخشانی دەق بۆ بەشی شێعری. با نێوی ئەو ڕێسایە دابنێین ڕێسای گۆڕانی پەردە.

دەقی بەیتی، لە ڕێگای ڕێسای گۆڕانی پەردەوە، بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە، گێڕانەوەی ڕووداوی قسەیی، لە ئاستێکی بەرزتر لەگێڕانەوەی ڕووداوی غەیرە قسەیی ڕادەگرێ. چونکە گۆڕینی چۆنیەتی گێڕانەوە خۆی لە خۆیدا، خاوەنی پەیامێکە کە سەرنجی خوێنەر یان بیسەر بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ.

کەم بەیت هەیە ئەم پەردە گۆڕانەی، لە کاتی وەدەنگ هاتنی کەسایەتییەکان، تێدا ڕوونەدابێ.

نموونە لەبەیتی ناسر و ماڵ ماڵ:

مەزن باوۆمەر سێ کچی بوون، یەکێکیان نێوی خاتوون تەورێزی بوو، ئەوی دی خاتوون ئەسمەر... حەزیان لە ناسر و ماڵ ماڵان کرد... ناردیانەکن مەزن باوۆمەری کچێمان بداتێ... مەزن باوۆمەر نەیداتێ. کچەکان سبحەینێ چوونە سەر کانیە.. ناسر و

**ماڵێ ماڵێ هاتنە کن کچەکان...هەر چوار سوێندیان خوارد، بازن و مۆریان پێکەوە گۆڕینەوە، دەوڵەت زیادیان خواست سوار بوون.**

[پەردە دەگۆڕێ:]

**کاکە ناسر دەڵێتە کاکە ماڵێ ماڵی‌یە:**

**خولاکەی چیە ئەو دنیا فانی‌یە**

**دەبلا بڕۆینە خزمەت وەزیری بەغدایە بەنۆکەری‌یە**[٣٧]

بە سەدان نموونەی ئاوا لە ناو بەیتە جۆراوجۆرەکاندا، دەدۆزرێنەوە. هەڵبەت ئەو تایبەتمەندیەش لە ڕێسای«پەردەگۆڕان»دا بەدی دەکرێ کە ئەوەندەی بەشی تەخت بۆ جێ گۆڕینەوە لەگەڵ بەشی بەند، لە کاتی وەدەنگ هاتنی کەسایەتییەکاندا، ڕووخۆش و دڵاوایە، بەشی بەند بۆ تۆرەدان و مەیدان چۆڵکردن بۆ بەشی تەخت لە کاتی دەسپێکردنی وەسف و گێڕانەوەی ڕووداوەکانی غەیرە قسەیی، ڕووخۆش نیە. واتە ئەو بەشانەش کە گێڕانەوەیان بەشێوەی عادەتی لەسەر شانی پەخشان و بەشی تەختە، بەند بۆ خۆی دەکەوێتە گێڕانەوەیان.

ئاکامی ئەو دۆخەش، بەرتەسک کردن و جاری واشە هەر قرتاندنی بەشی تەختە. هەڵبەت ئەگەر بێتوو بەشی بەند بەو جێگۆرکێیە قایل بێ، زۆرکەم وا هەیە ئەم پەردەگۆڕانە دووبارەیە، لە کاتی دیالۆگ و مۆنۆلۆگەکاندا ڕووبدا.

جگە لەو ڕێسا هەراوانە، هێندەك وردە ڕێسای تریش کاری گواستنەوەی ڕەگەزەکانی درامایی بۆ نێو دەقی بەیت، جێبەجێ دەکەن.

بۆ نموونە ئەگەر کوڕە حەیران بڵێ: «کوڵمەی ئەوێ ناسك بەدەنێ بە من بمێنێ بە پەلکی هەڵاڵە بەیبوونێ»، دەکرێ ئەو گوتەیە ناوی شێعری لە سەر دابنرێ. چونکە شوبهاندنێکی ناسك و جوانی تێدا بەکار هێنراوە. بەڵام ئەگەر بڵێ:«ئەوە کوڵمەی ئەوێناسك بەدەنێ دەشوبێنم بە پەلکی هەڵاڵە بەیبوونێ»، ئەوا تایبەتمەندی درامایی ئەو قسەیە، تایبەتمەندییە شێعرییەکەی دادەگرێ و

نەختێك کاڵی دەکاتەوە. چونکە شاعیر دەتوانێ لە شێعرەکەیدا، شوبهاندن بەکاربێنێ.بەڵام ئەگەر خۆی بە ئاشکرا و بە سۆزەوە ئەوە دەربڕێ کە خەریکە شتێك بە شتێك دەشوبهێنێ، ئەوا سەرەڕای بەکارهێنانی شوبهاندنەکە، دەیەوێ لەکارتێکردنی چەشنە دەربڕینێك ـ بە هەموو تایبەتمەندییەکانی درامایی ئەو دەربڕینەوە وەکوو لەحنی قسەوجووڵەی ئەندامەکانیلەش و... کەڵك وەربگرێ.

نموونەیەکیتر، بەکارهێنانی عادەتی وشەی«ئەوە» لە ناو بەیتدایە. کاتێك کەسێك دەڵێ«ئەوە دەڕۆم»، واتە ئێستا خەریکە بڕوا. کاتێکیش لە گێڕانەوەی رووداوێکی رابردوودا، وشەی «ئەوە» بەکاردێنێ، نیازی دووپارە نیشان دانەوەی ئەو رووداوە و قەناعەت پێ هێنانی زیاتری بەردەنگەکەی* هەیە. بەم شێوەیە،وشەی«ئەوە»،تایبەتمەندیەکی درامایی دەدا بە رستەی خۆی:

ئەوە کیژ راوەستا بوو لە بەر پێچی دەهەیوانێ
بە سێ دەنگان گازی دەکا کوڕە ماڵ وێران
دەبا لە هەواری بە منی سەرشینێ قەڵەندەرێ بابان وێرانێت کوتبا
ئێستا مەجالەتی خێل بەرەوژوورە، دەست لێک بەردانە.[٣٨]

لەم فەسڵەدا، باسی هێندەك لە تایبەتمەندییە هاوبەشەکانی هەموو دەقەکانی بەیت و باوکرا. لە فەسڵی داهاتوودا، هەوڵی نیشان دانی ئەو مەسەلەیە دەدرێ کە چۆن جۆرەکانی بەیت و باو، بەرەبەرە لە دەوری هێندەك تایبەتمەندی تەوەرەیی جیاواز و تازەتردا کۆدەبنە و لە جیاتی ئەوەی تێیاندا جەخت لەسەر درێژەپێدانی تایبەتمەندییە هاوبەشەکانی بەیت بکرێ، بەرەبەرە شەقڵ و شێوازی تازەتر، تەجرە بەدەکەن.

---

* بەردەنگ : مخاطب

هێلکاری ژمارە ٢

## پەراوێزەکان:


١. تزوتان تودورف ـ بوطيقاى ساختارگرا ـ ترجمه محمدنبوى ـ تهران ـ نشر آگه ـ چاپ اول ص ٢٨

٢. بابک احمدى ـ ساختار وتأويل متن ـ تهران ـ نشرمركز- چاپ چهارم ١٣٧٨ صص ٩ـ ٢٨٦

٣. هەمان سەرچاوە ـ ل ٢٨٦

٤. مۆتیف ـ بش هەر یەکەیەکی گێڕانەوەیە، بەلام لە دەرەوەی پۆلێن کردنی گوزارە ـ زنجیرە ـ دەق دایە

٥. تزوتان تودروف ـ بوطيقاى ساختارگرا ـ ترجمه محمدنبوى ـ تهران نشرآگه ـ چاپ اول ص

٦. هەمان سەرچاوە ـ ل ٩١

٧. ئۆسکارمان ـ تحفه مطفريه ـ پێشەکی و ساخکردنەوە و هینانە سەر رێنووسی کوردی: هێمن مەهاباد ـ چاپخانەی سەیدیان ـ ١٣٦٤ ل ٣٢٤

٨. بابک احمدى ـ ساختار و تأويل متن ـ تهران نشر مركز ـ چاپ چهارم ـ ١٣٧٨ ص ٨٢

٩. هەمان سەرچاوە ـ ل ٣١٣

١٠. هەمان سەرچاوە ـ ل ٨٣

١١. ئۆسکارمان ـ تحفه مطفريه ـ پێشەکی و ساخکردنەوە وهێنانە سەر رێنووسی کوردی: هێمن مەهاباد ـ چاپخانەی سەیدیان ـ ١٣٦٤ ل ٢١٥

١٢. ئەحمەد بەحری ـ گەنجی سەر بە مور ـ سلێمانی ـ پەخشی سەردەم ـ چاپی یەکەم ٢٠٠٠ ل ٢٤١

١٣. هەمان سەرچاوە ـ ل ٢٤٤

١٤. ئۆسکارمان ـ تحفه مطفريه ـ پێشەکی و ساخکردنەوە وهێنانە سەر رێنووسی کوردی: هێمن مەهاباد ـ چاپخانەی سەیدیان ١٣٦٤ ل ٢٠١

١٥. هەمان سەرچاوە ـ لل ١٧ ـ ٢١٦

١٦. هەمان سەرچاوە ـ لل٨ ـ ٢٣٧

١٧. ئەحمەد بەحری ـ گەنجی سەربەمۆر ـ سلێمانی ـ پەخشی سەردەم ـ چاپی یەکەم ٢٠٠٠ ـ ١٧٢

١٨. هەمان سەرچاوە ـ ل ١٩٠

١٩. هەمان سەرچاوە ـ لل ٣ ـ ١٩٢

٢٠. قادر فتاحى قاضى ـ شۆڕ مەحموود و مەرزینگان ـ تبريز ـ انتشارات دانشكدة ادبيات و علوم انسانى چاپ اول ـ ١٣٤٨ ـ ص ٩٠

٢١. تزوتان تودوروف ـ بوطيقاى ساختارگرا ـ ترجمة محمد نبوى ـ تهران نشر آگه ـ چاپ اول ص ٧٦

٢٢. ئۆسکارمان ـ تحفة مظفريه ـ پێشەکی و ساخکردنەوە وهێنانە سەر رێنووسی کوردی: هێمن مەهاباد ـ چاپخانەی سەیدیان ١٣٦٤ ل

٢٣. هەمان سەرچاوە ـ لل ١ ـ ٢٤٠

٢٤. یاسین حەسەن گۆران ـ لاوك و سترانی كوردەواری ـ هەولێر ـ چاپخانەی وازەرەتی رۆشنبیری چاپی یەكەم ١٩٩٨ ل ٢٢
٢٥. مەحموود شكاك نژاد ـ سروه ـ ژماره ١٣٩ ل ٣٥
٢٦. یاسین حەسەن گۆران ـ لاوك وسترانی كوردەواری ـ هەولێر ـ چاپخانەی وازەرەتی رۆشنبیری چاپی یەكەم ١٩٩٨ ل ١٧٦
٢٧. ئۆسكارمان ـ تحفه مظفریه ـ پێشەكی و ساخكردنەوه و هێنانە سەر رێنووسی كوردی: هێمن ـ مەهاباد ـ چاپخانەی سەیدیان ١٣٦٤ ل ٢٤٠
٢٨. ئەحمەد بەحری ـ گەنجی سەر بەمۆر ـ سلێمانی ـ پەخشی سەردەم ـ چاپی یەكەم ٢٠٠٠ ل
٢٩. عومەر شێخەللا دەشتەكی ـ داستان و گۆرانی لە فۆلكلۆری كوردیدا ـ هەولێر ـ چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری ١٩٩٨ ـ ٢١١
٣٠. هەمان سەرچاوە ـ ل ٢٢٢
٣١. تزوتان تودوروف ـ بوطیقای ساختارگرا ـ ترجمه محمد نبوی ـ تهران ـ نشرآگة چاپ اول ص ٦٠
٣٢. هەمان سەرچاوە ـ ل ٥٧
٣٣. لە وەرگێڕانی فارسی كتێبی تۆدۆرۆفدا، زاراوەی «وتەی گێڕدراوە» بە كار هێنراوە بەڵام چونكە وتەكان لەدوو شێوازی راستەوخۆ و ناراستەوخۆشدا، دەكرێ وەكوو وتەی گێردراوە ناودێر بكرێن،بۆیە لەم لێكۆڵینەوەیەدا، لە جیاتی ئەم زاراوەیە، زاراوەی «وتەی ئاگادار كەرەوە»مان بەكار هێناوە
٣٤. ئۆسكارمان ـ تحفه مظفریه ـ پێشەكی و ساخكردنەوه و هێنانە سەر رێنووسی كوردی: هێمن، مەهاباد ـ چاپخانەی سەیدیان ١٣٦٤ ـ ل ٤٨٤
٣٥. هەمان سەرچاوە ـ ل ٢٠٧
٣٦. هەمان سەرچاوە ـ ل ٢٠٧
٣٧. هەمان سەرچاوە ـ ل ٤٢٣
٣٨. ئەحمەد بەحری ـ گەنجی سەر بەمۆر ـ سلێمانی ـ پەخشی سەردەم ـ چاپی یەكەم ـ ٢٠٠٠ ـ ل ٢٤

له زاراوه‌ناسی* ره‌خنه‌ی ئه‌ده‌بیدا، ده‌سته‌واژه‌ی «رێساکانی ژانر» زاراوه‌یه‌کی ئاشنایه. بۆ نموونه له‌باره‌ی چۆنیه‌تی پرۆسه‌ی به‌رهه‌م هاتنی مانا له‌لایه‌ن ده‌قه‌وه، گوتوویانه که ده‌ق به دوو شێوه، مانادار بوونی خۆی ده‌چه‌سپێنێ:

١- ئیرجاع بۆ رێساکانی ژانر

٢- ئیرجاع بۆ تێگه‌یشتنی هاوبه‌ش.**

ته‌واوی ئه‌و نووسراوانه‌ی که ده‌کرێ له چوارچێوه‌ی ژانرێکی تایبه‌تیدا جێگیربکرێن، به هۆی په‌یره‌وکردنی ئه‌و هێڵه‌گشتییانه‌ی له‌م ژانره‌دا به راست ده‌گه‌رێن،ئاشنابوونی‌پێکهاته‌ی‌خۆیانو وه‌رگیرانی ماناکانیان ده‌سته‌به‌رده‌که‌ن. به‌لام هه‌میشه به‌رهه‌مه‌کان له‌ناو چوارچێوه‌ی ته‌واو ئاشنادا ناحه‌جمێن، به‌ڵکوو له‌وانه‌یه تێپه‌راندنێك له‌سنووره خووپێکراوه‌کان، وه‌به‌رچاو بکه‌وێ.

تۆدۆرۆف ده‌ڵێ:

«هه‌ر به‌رهه‌مێکی ئه‌ده‌بی، ئاڵ و گۆڕ به‌سه‌ر ژانری خۆیدا دێنێ واته زمانی ئه‌ده‌بی به شێوه‌یه‌که که تێیدا هه‌ر په‌یفێک، غه‌یره رێزمانی‌یه»[1]

---

* terminology ترمینولوژی

** common sense شعور متعارف

ئەم گوتەیە، بەم مانایەیە کە هەر دەقێکی ئەدەبی، سەر بە هەر ژانرێك بێ لە روانگەیەکەوە، بەرهەمێکی تاقانایە و خاوەنی سیمای تایبەت بە خۆیەتی.

لە فەسڵی پێشوودا، باسی ئەوە کرا کە چۆن بەیتەکان، پەیڕەوی لە ڕێساکانی ژانری خۆیان دەکەن واتە قسە لەۆ پێکهاتەیە کرا کە بناغەی بەیت پێك دێنێ. بەڵام ئایا دووان لە خاڵە جیاوازەکانی ئەو دەقانە، بەبەریەوە هەیە بەرووبوویەکی درێژ بەرهەم بێنێ؟

بۆ شیکردنەوەی مێکانیزمی گەشەی پێکهاتەیی بەیت، ناچارین بە دوای وڵامی ئەو پرسیارەدا بگەڕێین کە چۆن بەیت وەکوو دارێك دوای ریشەداکوتان، لق و پۆی جیاجیای دەرکردووە و لە وێکچوون و هاوبەشییەوە بۆ لای ناوازەیی و جیاوازییەوە پەلی کوتاوە.

شارەزابوون لە شیکردنەوەی پێکهاتەی دەقێکی بەیتی، بریتییە لەتوانای لێك کردنەوەی وردی تایبەتمەندییەکانی هاوبەش و جیاوازی ئەو دەقە. لەبەشەکانی پێشوودا گوتمان دۆزینەوەی چوار چێوەی گشتی بەیت، لە چاو خوێندنەوەی جیاجیای دەقەکان و بە دەستەوەدانی راڤەیەکی تایبەتی بۆ دانەدانەیان، شێوازێکی بە کەڵکترە. لێرەدا، ئەو بۆچوونە بەم جۆرە تەواودەکەین کە شێوازی دەسنیشان کردنی هاوکاتی هێڵەکانی وێکچوون و رەهەندەکانی جیاوازی بەیتەکان، لە چاو هەر دووك شێوازی پێشوو، لە بارتر و بەپێزترە.

بۆ سەلماندنی پێویستی ئەو شێوە لێکۆڵینەوەیە، باسی دەقێکی «گەلۆ» دەکەین کە ئەو وردە ڕێسا و کۆمەڵە تەکنیکانەی تێیدا بەکارهێنراوە بە پێی«رەگەزە هاوبەشـــــــــــەکانی بەیت» لێك نادرێتەوە و ناچارین بۆ روونکردنەوەیان پەنجە بۆ راستی توێکڵ دەردان و رەنگ گۆڕینی ڕێسایی و پێکهاتەیی و مانایی بەیت رادێرین:

جەمعی گوڵان پۆل بەست دەبوون

دەچوونەوە کن شەوبایە شەماڵێ کە شەوگەرە و دەگەرێ لە کوێستانی

دەباسەفایە

دەیانکوت شەماڵ ئەتۆ شەوگەڕی و دەگەڕێی

وەرە سەیری بەژن و باڵامان کەو بڕوانە

کێهەمان جوانین لە سەر ئەوێ کاولە دونیایە

شەماڵ دەڵێ گوڵینە هەمووتان جوانن

هەمووتان شۆخ و نازدارن

هەمووتان دڵتەڕ و لە بارن

بەڵام ئەگەر دوو ڕۆژانو بارینی ڕەحمەتی لێ نەدا

بەردەدەنەوە سەری خەجاڵەتێ

سیس دەبن لە بەر ئەوێ گەرمایە

بەڵام سوورە گوڵێك هەیە لە باغی شەددادی

ئەو سوورە گوڵە پاییز و هاوینێ

زستان و بەهارێ

ساڵ دەری دوازدەی مانگە

بە شەو و بەرۆژ لە میجازێکی دایە

ئەگەر ئەویشتان بێتە گەڵێ

نابنەوە بەخاڵێکی شیرن لەیلایە.[٢]

کە بەیت دەگاتە ئێرە، سێ سەنعەتی مانایی ورد و سەرنج ڕاکێش، پێکەوە تێکەڵ دەبن:

**ئەلف ـ موبالەغە:** پۆل بەستی تەواوی گوڵان، لەگەڵ شاگوڵی باغی شەدداد، بە هەموویانەوە نابن بە خاڵێکی شیرن لەیلایە.

**ب ـ غافلگیری:** بە خوێندنەوەی ئەم دەقە لە دێری پانزەرا «ئەوە شەڕێکە لە نێوان گوڵانی جوانی دەهەاری باسەفایە» (کە ئەو دێرە لەم نموونەیەی ئێمەدا نەهاتووە) هەتاکوو دێڕی ٤٨ (ساڵ دەری دوازدەی مانگە /بە شەو و بە ڕۆژ/ لە

میجازێکی دایە) کە سەرجەم ٣٢ دێڕ دادەگرێ، خوێنەر یان بیسەر پێی وایە ئەوە وەسفی جوانی گوڵەکەی باغی شەدداد دەکرێ بەڵام بە دوو دێڕی (ئەگەر ئەویشتان بێتەوە گەڵێ/ نابنەوە بە خاڵێکی شیرن لەبلایە) گریمانەی خوێنەر لە ناکاو تێك دەڕووخێ و گریمانەیەکیتر جێگای دەگرێتەوە.

پ ـ کۆنتراست:

گوڵی باغی شەدداد، بە وەسفێکی ٣٢ دێڕی ، زۆر بەرز دەبێتەوە و لە ناکاوێك، بە هێنانی دوو دێڕ، بۆ مەبەستێکی تایبەتی لە عەرزی دەدرێ ونزم دەبێتەوە. کۆنتراست و دژایەتی نێوان ئەو بەرزی و نزمییە، سەرنجی خوێنەر رادەکێشێ. کۆبوونەوەی ئەم وردەکارییانە تایبەتە بە دەقی گەلۆ.

ئەوە، نموونەیەك بوو لەجیاوازی دەقێکی تایبەتی لەگەڵ کۆمەڵەی دەقەکانیتر، بەڵام ئەوەمان لەبیرنەچێ جیاوازییەکانیش، بەرەبەرە رێساکانی خۆیان دۆزیوەتەوە و بەدەوری تەوەرەکانی تایبەتدا، کۆبوونەتەوە. با بزانین ئەو تەوەرانە، کامانەن.

## ١ـ چوونە سەری ڕێژەی زاڵ بوونی یەکێك لە سێ ژانرەکان

توێژینەوەی زانستی لە سەر بەیت (بەمانای تایبەتی)، بە بێ باس کردنی جۆرە جیاوازەکانی‌تری فۆلکلۆری وەکوو لاوك و حەیران، توێژینەوەیەکی ناتەواوە. بێ گومان دەقی لاوك و حەیران لە زۆربارەوە، شێوەکانی دیار و نادیاری خزمایەتی خۆیان لەگەڵ دەقی بەیت، سەلماندووە. لاوك و حەیران، چ پێوەندێکیان لەگەڵ بەیت هەیە؟ هاوبەشی و جیاوازییەکانی ئەم دەقانە لەگەڵ بەیت لەچی دایە؟ ئایا لاوك و حەیران لە گووران و گەشە کردندا، ژیانێکی سەربەخۆیان هەبووە یان هەر کامەیان لقێکی تایبەتی بەیتن و لەداوێنی دایکی بەیتەوە سەریان هەڵداوە؟

لە راستیدا، دەکرێ بڵێین بەیت لە سەر بناغەی یەکێك لەشێوازەکانی گەشە کردنیەوە، حەیرانی بەرهەم هێناوە و لە سەر بناغەی لایەنێکی‌تر و شێوازێکی‌تر، لاوکی بەرهەم هێناوە. لە بەشەکانی پێشوودا گوتمان دەقی بەیت بە تێکەڵاوی رەگەزەکانی سێ ژانری چیرۆك و شێعر و دراما، شەقڵ دەگرێ و رەگەزەکانی ناوەندی سەر بەچیرۆکن و رەگەزەکانی درامایی و شێعری، لەم بەر و ئەوبەری ئەو ناوەندە، جێگای خۆیان دەدۆزنەوە.

بە درێژایی گەشەکردنی بەیت، ئەم هاوسەنگییە ناسراو و چەسپاوە لە نێوان رەگەزەکان تێك دەچێ و شێوەکانی‌تری هاوسەنگی پێك دێن.
لە ئاکامی لەنێو چوونی لایەنی داستانی و گەشەسەندنی شان بە شانی لایەنی شیعری و لایەنی درامایی، هێندەك شێوازی بەیتی پێکهاتوون کە حەیران لە ناوەندیاندا راوەستاوە.

ئەو چوارچێوانە، بێجگە لە حەیران لە دەقەکانی گەلۆ و پایزە و ئازیزەدا، بەرچاو دەکەون.لە حەیران و دەقە هاوشێوەکانیدا، گێڕانەوە دەورێکی لاوەکی

دەگێڕێ و تێیدا باسی رووداو یان کارەساتێکی تایبەت ناکرێ، بەڵکوو باسی ئەوین و سۆزەکانی دڵداری دێتە گۆڕێ.

گەشەی لایەنی درامایی بە زاڵ بوونی مۆدێلی (کوڕ دەڵێ ـ کیژ دەڵێ)، بە ئەنجام دەگا و گەشەی لایەنی شێعری بە وێچوواندنی زۆر و ناسك بوونەوەی قسەکان تا ئەو پەڕی خۆیان لەکاتی پێهەڵگوتن و وەسفی ئەویندارانە دا و هەروەها بە خەست بوونەوەی سۆزو کوڵ وکۆی خۆشەویستی، روودەدا:

ئەورۆ ئەوە کیژ دەڵێ

ئەمن پۆلێکم شورە سوار و حودوود سوار دەدیتن

دایاندەبەشێوە رەشەڕاوە

بەختی منی ماڵ وێرانێ قەلەندەر هەڵیاندەستاند جەیرانە

ئەمن لەوان سواران خورد دەبوومەوە

سەر زینیان بە شەجەرن، دانە لغاویان مروارین، ساساکاری /؟/ گەرمێنێ

وەی لاڵ بم نەمناسی سەر راوی سەر ئەوان، هەتیوە جەیرانە،...

ئەو رۆ ئەوە ئەستێرێك هەڵدێ لەمن لە ئێمەنێ

تەرازوو هەڵدێ کۆی ناگەنێ،

ئەوە کیژ زۆلفت زۆرجوانە مەیدە دەخەنێ

ئەمن چەندم رەشە رێحانە و سوورگوڵ دەدیتن لەوێ بەندەنێ

ئەوە کوڕ دەیگوت

کیژێ ئەمن چووکەڵە سەفەرێکم لە بەرە

رەبی خوداگیری من بی هەتا وەکوونێ لەو سەفەری دێمەوە

تو خوا شەمامە و شەمامە رەنگینانت دەدەس کەس مەنێ[٣]

مۆدێلی گۆڕین، بەرەبەرە لە دەقی حەیراندا بەچەشنێك گۆڕانی بەسەرهاتێ کە دەنگی کوڕ وەسەر دەنگی کیژ دەکەوێ و لە هێندەك حەیراندا، تەواوی دەق بریتی‌یە لە وەدەنگهاتنی یەکەم کەسی تاك و بەردەنگ بوونی

دووەم کەسی تاك.بەم شێوەیە، کوڕە حەیران دەیەوێ لەکاتی غیاب و دووری کچە حەیراندا، بە گازیکردن و رووتێکردنی، ئامادەبوونی خۆشەویستەکەی مۆدێلسازی بکاتەوە.

خاڵێکی زۆر سەرنج ڕاکێشتر، ئەوەیە کە لە هێندەك دەقیتردا، بێجگە لە کیژ، کۆمەڵی دۆست و برادەری کوڕە حەیرانیش دەبنە بەردەنگ و بیسەری دەربڕینی کوڵ و کۆی ئەو. ئەم بارودۆخە تەواو وەك ئەوەیە لە شانۆیەکدا، دوو کەسایەتی بە ناوی کــوڕەحەیران و کــچەحەیران دەور بگێڕن و جەماعەتێکیش خەریکی تەمەشاکردنی ئەو شانۆیە بن.

کوڕینە کۆ و تەرازوو هەڵدێن، ئەستێرە لەمن دەسێنە
کوڕینە برینی هەموو دۆست و برادمران دێننەوە سارێژێ
لی من و بەژنی باریك وزەندێ بە بازن بە سوت و سوێنە
لە بسکوڵێ بە گوڵێ دەمانە
ئەمن سەرێکە خۆم هەڵدێنا تەماشای بەژنی باریکم دەکرد
سەری هەڵنایە لە بەر خاڵ و پارچەمانە، قوڵێ لە بەر بازنانە
کیژ دەڵێ کوڕە حەیران ئەتۆ لە ماڵۆکەی دەخۆت مەیەنەوە چ جوداییان
هەتا منیش لە ماڵی دەبابان لە بۆت دانەگرم تازیە و غەمانە[٤]

لە حەیراندا، لە نێوان سێ ئاڵقەی نزا و گێڕانەوە و ڕۆرۆ، هەر بەتەنیا ئاڵقەی نزا تەواوی دەقەکە دەتەنێتەوە، و لە چوار شێوەکەی نزاش واتە:

١ـ پاڕانەوە لە خوا و هاوار بردنە بەر پیاوچاکان ٢ـ خۆزگە خواستنی ئەویندارانە ٣ـ گاز کردنی یار و پێهەڵگوتنی ٤ـ عەرزی حاڵ، سێ جۆرەکەی دوایی بە تەواوی دەسەڵاتداری ناو دەقی حەیرانن.

پێکهاتەی حەیران بەم تایبەتمەندییە سەرەکییانەی باسیان لێکرا، بەشێکە لە پێکهاتەی بەیت. واتە لە بەشێکی بەیتی دڵداری لە پلەی یەکەمدا، مۆدێلی

(کوڕ دەڵێ ـ کیژ دەڵێ)، شەقڵ دەگرێ و لە پلەی دووهەمدا وەسف و پێهەڵگوتنی ئەویندارانە وەکوو حەیران، تەواو تایبەتمەندیەکی شاعیرانە پەیدا دەکا و لە پلەی سێهەمدا، هەرسێکیابەتی خۆزگەخواستنـــــی ئەویندارانە و گازیکردنی یار و عەرزی حاڵ، تەواوی رووبەری ئەو بەشە دادەگرن. با بە وردی سەرنج بدەینە چۆنیەتی وەدەنگ هاتنی کاکەمەم لەم بەشەی بەیتی مەم و زیندا:

رۆژم لێ هەڵات، گەیوەتە نیوەڕۆیە
روومەتی یایەزینێ گەلێک زەریفترن لە گوڵی لیمۆیە
بریا ئەو دەست و جام وبام ئەگەر یایەزین بە دەستی موبارەکی ـ
دەیاویتمەوە سەر رووی جۆیە
رۆژم لێ هەڵات، گەییە فەسڵی ئێوارێ
روومەتی یایەزینێ گەلێک زەریفـترین لە دەنکی دەههەنارێ
بریا ئەو تاس و تەبەقە بام ئەگەر یا بەزین بە پەنجەی موبارەکی ـ
دەیاویتمەوە سەر تاتە شوارێ...
رۆژم لێ هەڵات گەیوەتەوە نوێژی خەوتنێ
روومەتی یایە زینێ گەلێک زەریفـترین لە گوڵێ دەسوێسنێ
رەببی خولا گیرم بی ئەوێ رۆژێ دەکا دیوانی دەگەڵ دیوان کردنێ
یایە زین بەڵای ئەمن دەست لەتوو هەڵناگرم هەتتا رۆژی مردنی[٥]

لە سەرەتای بەندەکانی بەیتی لاس و خەزاڵدا[•]، چەند لاپەڕە تەرخان کراوە بۆ پێهەڵگوتنی دوو لایەنەی لاس و خەزاڵ. نموونەی ئەوتۆ لەبەیتی دڵداری دیکەشدا بە هاسانی دەدەوزرێتەوە.کەواتە شێوازی دروست و زانستی بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوویی و گەڕان بە دوای چونیەتی سەرهەڵدانی حەیران ئەوەیە کە لێکۆلینەوەکەمان هەنگاوێك بگەڕێنینەوە بۆ دوایەو سەرهەڵدانی حەیران

[•] نوسخەی لوسکارمان ـ لە لاپەڕەی ٣٣٦ هەتا لاپەڕەی ٣٤٢

ببەستینەوە بە سەرهەڵدانی بەیت.(دیارە زۆربەی بەیتناسانیش لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کە بەیت لە ناوچەی موکریان سەریهەڵداوە.)

سروشتی لاوکیش لەم بارەیەدا وەکوو سروشتی حەیرانە. بەڵام سەبارەت بە لاوک، تێبینیەك پێویستە. کە دەڵێین لاوك لەداوێنی بەیتدا بەرهەم هاتووە لەوانەیە خراپ حاڵی بوونێك بۆ سەلماندنی درێژەی باسەکە، ڕێگامان لێبگرێ. ئەو خراپ حاڵی بوونە لەم پرسیارەدا خۆ دەخاتەروو کە چۆن لاوك کە بە زاراوەی کرمانجی سەرووە، لە بەیت ـ کە زاراوەی کرمانجی نێوەڕاستە ـ بەرهەم هاتووە؟

لە وەڵامدا دەبێ ئاماژە بەو خاڵە بکەین کە بەیت هەر بە تەنیا بە زاراوەی کرمانجی نێوەراست نەگوتراوەتەوە. بەڵکوو زۆر بەیتی وەکوو خەج و سیامەند، سەیدەوان، زەمبیل فرۆش و مەم و زین بەر هەر دووك شێوازی سەرەکی هەن.[٦]

روونکردنەوەیەکی پێویستیتر، لە بارەی لاوك، وەبیرهێنانەوەی ئەو بابەتەیە کە بەشێکی زۆر لە لاوکەکان سەر بە هەمان پێکهاتەی بەیتن و هیچ جیاوازییەك لەم زەمینەیەدا نیە و هەر لە بەر ئەوەی گوتنیان بە زاراوەی کرمانجی سەروو بووە، ئەو ناوەیان بە سەردا ـ براوە. بۆ نموونە لاوکی گەنج خەلیل[*] خاوەنی پێکهاتەیەکی تەواو وەکوو بەیتە و هیچ لەمپەڕێك ڕێگامان لێ ناگرێ بۆ ئەوەی بڵێین «بەیتی گەنج خەلیل». واتە لە گەنج خەلیلدا وەکوو بەیتەکانیتر، رەگەزەکانی شێعر، چیرۆك و دراما، بە ناوەندێتی رەگەزەکانی چیرۆك ئامادەن.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا، مەبەسەت لە لاوك، ئەو بەشە لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردییە کە تێیدا هاو سەنگیی ئەم رەگەزانە بەو شێوە باسکراوە، تێك چووە هاوسەنگییەکیتر جیگای گرتۆتەوە. لە لاوکدا لایەنی شێعری کز دەبێ و لایەنی

[*] نوسخەی یاسین حەسەن گۆران

داستانیش بە بێ ئەوەی کزبێ، دەبێتە بەشێك لە لایەنی درامایی. بە واتایەکیتر لە دەقی لاوکدا دەسەڵات بە شێوەیەکی ڕێژەیی لە دەستی ڕەگەزەکانی درامایی دایە و گێڕانەوە تێیدا، گێرانەوەیەکی تەواو دراماتیکە. بەڵام دراماتیك بوونی لاوك لەگەڵ دراماتیك بوونی حەیران جیاوازی هەیە.لە حەیراندا بەهێز بوونی ڕەگەزەکانی درامایی بەستراوەتەوە بە دیالۆگی ڕاستەوخۆی کیژ و کوڕەوە. لە لاوکدا بوونی ئەو دیالۆگە، بەشێك لە سروشتی درامایی دەق پێك دێنێ. بەڵام بەشێکی تری پێکهێنەری ئەو سروشتە بەستراوەتەوە بە چەمکی «کێشە».

کتێبی«دراما» لە نووسینی «س.و. داوسۆن» ئاوا چەمکی کێشە، روون دەکاتەوە:

«کێشە وشەیەکی ئەوتۆیە کە بێ ئەملاولەولا، لە هەموو باسەکانی پێوەندیدار بە درامادا دوویات دەبێتەوە. هەر جارەی بمانهەوێ نیشان بدەین کە بارودۆخی ئێستا، هەرسات ئەگەری ئەوەی بۆ هەیە ببێتە بارودۆخێکی تەواو جیاواز، ئەوا قسە لە بارودۆخێکی «پڕکێشە» دەکەین.

تایبەتمەندی دراما ئەوەیە کە پێوەندی نێوان بەشەکانی پێوەندییەکی پڕ کێشەیە. چەند جۆر کێشە لە درامادا هەیە وەك: کێشە لە نێوان شێوەکانی جیاوازی تێگەیشتنی قسەیەکەرانەوسی دراماتیکدا، کێشە لەنێوان دوو کەسایەتی و... بەڵام کێشەی بناغەیی و درێژخایەن بریتییە لەکێشەی نێوان بارودۆخی سات بە سات و سەرجەمی کردەوەکان.»[٧]

دەقی لاوك بەم مانایە، لەچاو شێوەکانیتری ئەدەبی فولکلۆری کوردی، دەقێکی پڕکێشەترە. لەلاوکدا، بە چەند شێوەی تایبەت گێڕانەوە چڕ دەکرێتەوە. هەر ئەمەش بۆ تە هۆی کورت بوونی دەقی لاوك.

لە لاوکدا وا نیە نزا و رۆرۆ، بە یەکجاری وەلابنرێن،بەڵام مەبەستی سەر بەم ئاڵقانە، بە گشتی لە چەند وشەدا ، دەخرێنەروو .ئەمەش بە پێچەانەی ڕێسای شێوەکانیتری بەیت وباوە کە جاری وایە تێیاندا، نزا یان رۆرۆ، چەند بەندی

درێژ بۆخۆیان تەرخاندەکەن. ئەوەی لە لاوکدا دەگێڕدرێتەوە، زیاتر پێوەندی بە بارودۆخێکەوە هەیە کە مەترسی قەومانی کارەساتێکی لێدەکرێ. زۆرێك لە لاوکەکان بەم رستەیەوە دەست پێ دەکەن: ئەورۆ شەرەك دادکەتە...

هەڵبەت ئەم رستەیە جگە لەوەی بارودۆخێکی پڕ مەترسی نیشان دەدا، لە رێگای وشەی «ئەورۆ» شەوە، ئامادە بوونی زیاتری کەسایەتییەکان و رووداوەکان، نیشان دەدا. لێرەدا، وشەی ئەورۆ هەمان نەخشی وشەی «ئەوە»ی هەیە کە پێشتر باسی لێ کرا.

دیسان هەر بۆ زیاتر زەقکردنەوەی رووداوەکان، و ئیسپاتی راست بوونیان، لە زۆربەی لاوکەکاندا، باسی شایەدەکانی ئەو رووداوانە، بە رستەی «ئیرۆ شادا شوهودێ وی گەلەك هەنە» دەکرێ.

دوای چڕکرانەوەی گێڕانەوە، نۆرەدەکا بە داکۆکی کردن لەسەر کێشە. کێشە لە زۆربەی لاوکەکان، بەم شێوەیە دەرسکێ کە دوای ئەوەی باسی بارودۆخێکی پڕ مەترسی کرا، ئاکامی ئەو بارودۆخە، بە وردی روون نابێتەوە. واتە حاڵەتێکی هەڵواسران (تەعلیق) ساز دەبێ و خوێنەر یان بیسەر چاوەڕێی ئاگادار بوون لە بە سەر هاتی کەسایەتییەکانە. دیارە هەڵواسران یەکێك لە شێوەکانی سازکردنی کێشەیە.جا لە بەرئەوەی ئاکامی تراژیکی کارەساتەکان، راستەوخۆ باسیان لێناکرێ، شین و رۆرۆش نابێتە پێویستییەکی دەق.

بەم شێوەیە دەبینین هەموو بەشەکانی پێکهێنەری لاوك، بۆ خولقاندنی دەقێکی دراماتیك ـ یان بە لانیکەمەوە دەقێك بە تایبەتمەندی دراماتیکی زۆرتر لە چاو دەقەکانیتر ـ دەستوەدەستی یەکتر دەدەن.

لاوکی میرپەنجۆ: ئەمن ناچمە قەلاتی دزێ دەشتێ مەلگەورێ ل من وا بە بییە
عەسکەرێ ئەفلاتونیان و ئەبوستێران بەوێ سپێدێ دەورانی گرتییە
ئیرۆ شادا شوهودێ میر پەنجێ میرێ کوردان گەلەك هەنە

ب سێ دەنگان گاز دکردێ: نووری لە برا ئەسکەندەر خان
عەولا بەگێ بێناریێ، بابێ من تەخسیرێ ب کوشتنێ مێران نەکەن
شەرەکی دقەوما سەلماس و دیلەمانێ، سەردەشتێ ملگەومڕێ،
بەر قەلاتی دزێ
ئەوە تەشبیهات بکەین ب شەڕێ چەند قەلعەو قەرس وبازدییا
گەلی خۆرتان! دێنگۆ دەستێ خۆ باوێنە سەر قاپی
سی تیرا، ئۆبراغێ جەبەلخانا بدەنە پالا وێ چیاێ
بەرێ سپێرێ بلند بکەن ل مەکینی تەیارا ل عاسمینێ ل عەوایێ
بەلکی میر پەنجێ مەیێ دەلال، بەگ لیکی کوردان، دلۆ گاوەکی
موشوغولییا خۆ دەینی. ب وێ یار و غەزاێ وۆـــــ وۆ[٨]

حەز دەکەم دیسان جەخت لەسەر ئەم مەبەستە بکەم کە بەشێکی زۆر لەو دەقانەی بە لاوك دەناسرێن، فۆرم و ناوەروکێکی جیا لە هی بەشەکانیتری بەیت و باویان نیە و هەر بە تەنیا جیاوازی زاراوەیان جیای کردوونەتەوە. با بە وردی سەرنج بدەینە وێکچوونی ئەم دەقەی خوارەوە لەگەڵ دەقی حەیران:

ئای دەلال، ئای دەلال، ئای ئای ل من
ئای لێ گەلی گوندیان و جیرانان و خزمینە!
ناوێ یارێ من گوڵبەهارە، ل دەوێ من چەند شیرینە
وەی لێ مەیلێ لە سەرێ یارێ من
ئای لێ گەورێ چل وچار کەزینە
بەلێ تاسێ سەرێ خەلك و عالەمێ زیوە
تاسێ سەرێ یارێ من دوڕو یاقووتە
هەوارە گەورێ، لولۆیێ زێرینە
سێ کانیکا لە بەینێ جۆتێ مەمکێ یارێ من هەڵداینە
یەکا تالە، یەکا ترشە
ژ تالع و بەخت و ناوچەوانێ منڕا یەك شیرینە

ئای دەلال، دەلال، دەلال، حالێ من ب تنێ[٩]

هەتا ئێرە، تیشکمان خستە سەر پێکهاتەی لاوك و حەیران.لکێکی‌تری ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، بەشێکە لە بەیت و باو کە دەکرێ بە«مەنزوومە» ناوی بێنین.

سوارەی ئیلخانی‌زادە، لە ناو ئەدەبی کوردیدا، چوار شێوە شێعر بەم چەشنە لێك جیا دەکاتەوە:

**١ـ شێعری وتاری یان بەیتی**

**٢ـ شێعری برگەیی**

**٣ـ شێعری عەرووزی**

**٤ـ شێعری نوێ[١٠]**

حەیران نموونەی رەسەن‌ترین شێوەی شێعری وتارییە. تایبەتمەندییەکانی ئەم جۆرە شێعرە، بەم شێوەیەن:

**ئەلف:** پابەند نەبوون بە کێشێکی برگەیی دیاریکراو.

**ب:**نالێکی درێژایی دێرەکان.

**پ:** نالێکی درێژایی بەندەکان.

**ت:** مەیلی دێرەکان بۆ درێژ بوونەوە و خۆلەبەریەك کێشانەوە.

لە مەنزوومەی فولکلۆریدا، کە بە گوێرەی بۆ چوونی سوارە، پێکهاتەکەی بە شێعری برگەیی هەڵدەچنرێ، چوار تایبەتمەندی جیاواز لەم تایبەتمەندیانەی سەرەوە، واتە پەیرەوکردنی کێشێکی برگەیی، رێك بوونی درێژایی دێرەکان و جاری وایە بەندەکانیش و مەیلی دێرەکان بۆ کورت بوونەوە بونیادی دەق پێکدێنن.

**بەیتی فەقیری**

دەچن بۆ ماڵە جیرانان

پەیدا بکەن یەکێ دوو نانان

ئانێکی پێ پەیدا نابێ

کوڕی دێتن لەدوو بابێ

نیزامی هاتووە گیر نابێ

زوو برۆ بچوو بە تەرِدەستێ

چەندی دەکەین راناوەستێ

جووجەی دەوێ دەگەڵ ماستێ [١١]

لەم بەیتەدا، هەموو بەندەکان، سێ دێڕو هەموو دێڕەکانیش، هەشت بڕگەن. بەیتا کەوا:

ئەڤرۆ هات و بهارە

دەربوون چۆم و جەلالە

هاتن تەیر و ئیخالە

هاتن تەیر وکەودەری

مەجل دگۆتە عەلی

مەجل دگۆتە حاجی

ئەڤـ کەوگیرێ سوتییە

عەمێ لە بۆ هاتییە

عەمێ لە خۆ ئەڤێتە

هەتا پێ سۆر نەهێتە

پێ سۆر ل دەشتێ تێتە. [١٢]

مەنزوومە، لە چوار چێوەی ئەو ئاڵ و گۆڕە فۆرمییانەدا دەمێنێتەوە و گۆڕانی زیاتری بە سەردا نایە و هاوسەنگی ناسراوی نێوان سێ رەگەزەکانی گۆڕین تێکناچێ. هەڵبەت لەقاڵبدرانی تەواوی دەق بە شێوەی نەزم، لە مەنزوومەی فۆلکلۆریدا، نابێتە هۆی چوونەسەری رێژەی ئامادەبوونی رەگەزەکانی شێعری. نەزم و شێعر، هەر بە تەنیا لە شێعری شاعیرانی گەورەدا بەشێوەیەکی قەراردادی،هاونشینبوونەوپێویستییەکی ئەوتۆ لێکیاننابەستێتەوە. کورتەی باس و خواسەکانی ئەم بەشە لە هێڵکاری ژمارە ٣دا، نیشان دراوە.

چوونە سەری ڕێژەی ئامادە بوونی یەکێك لە
سێ ڕەگەزەکانی چیرۆك و شیعر و دراما
حەیران
لاوك
مەنزوومە
کزبوونی لایەنی داستانی و
بەهێز بوونی ڕەگەزەکانی درامایی
وەلاتانی شیعری وتاری و کەلك وەرگرتن لە شیعری مەنزووم
نەگۆڕینی چۆنیەتی هاونشینی ڕەگەزەکانی شیعر و چیرۆك و دراما
بە هێز بوون ڕەگەزەکانی شیعری
بە هێز بوونی ڕەگەزەکانی درامایی
چڕکردنەوەی گێڕانەوە
جەخت لە سەر کێشە
وێچوواندن و وەسفی شاعیرانە
دیالۆگی کوڕەحەیران و کچە حەیران
وەلاتانی ئاڵقەکانی نزا و ڕۆژێ
تایبەتمەندییەکانی شیعری وەمەنزووم
کێشی بڕگەیی دیاریکراو
ڕێك بوونی درێژایی دێڕەکان
مەیلی دێڕەکان بۆ کورت بوونەوە

## ٢ ـ لادان لە مەنتیقی مەجازی

سەرکەوتنی بە تۆرەی خوازە و مەجاز، هەر بە تەنیا تایبەت بە نیزامەکانی کەلامی نیە و لە بارەی نیزامەکانی‌تری نیشانەییش وەراست دەگەڕێ. یاکۆبسن وەبیرمان دێنێتەوە کە لە بەستێنی وێنەگەریدا، شێوازی کووبیسم بە ئاشکرا لە سەر مەجاز دامەزراوە و لە سووریالیسمدا، روانینی وێنەگەر، روانینێکی تەواو خوازەییە.[١٢]

هەر بەم شێوەیە، باسی گشتی زاڵ بوونی مەجاز یان خوازە، دەقی ئەدەبیش دەگرێتەوە. بەم هۆیە لە فەسڵی دوو دا، ئەو پرسیارەمان هێنایە گورێ کە دەقی بەیت خاوەنی کامە مەنتیقە و هەر لەوێدا وەڵامما‌ن داوە کە لە بەیتە درێژەکاندا، مەنتیقی مەجازی زاڵە. بەڵام جارجارە، لادانێك لەم مەنتیقە دەبیندرێ.

لە هێندەك بەیتدا، رووداوەکان بە ئانقەست، بە تەواوی ناگێردرێنەوە. بەڵکوو بە ئاماژە و بە شێوەیەکی تیشك ماوێژ، چەند پاژێك لە گەڕیانی داستانی بەیت، لە گوتندا جێگایان بۆ دەکرێتەوە و وەبیرهێنانەوە یان ئافراندن و تەواو کردنی بەشەکانی‌تر، حەواڵە دەکرێ بۆ «یادەوەری بە کۆمەڵی خەڵك»، یان بۆ خەیاڵی داهێنەری بیسەر و خوێنەر.

بەیت بۆ ئەو جۆرە کورت بوونەوەیە، کەڵك لە ناسران و بڵاوبوونەوەی داستانی بەیت لە ناو خەڵکدا وەردەگرێ. ئەو رووداوانەی بوونەتە هەوێنی پێکهاتنی بەیت، ئەو کارەساتە گەورە و شوێندانەرانە بوونە کە لەکۆمەڵی کوردەواریدا قەوماون یان بەشێوەیەکی سیستماتیك و سروشتی، چاوەڕوانی روودانیان بۆ دەکرێ. کەواتە کاتێك چۆنیەتی قەومانی رووداوێك، لە یادەوەری خەڵکدا ئامادەیە، یان ئاسۆی بیری خوێنەر وبیسەری کورد، دەسەڵاتی

مۆدێلسازی تەواوی دەقێكی ئەوتۆی هەیە، بەیت تا ئەو جێگایەی بۆی دەكرێ، وردەكارییەكانی ئەدەبی خۆی بە قوربانی گێڕانەوەی تەواو و ناپێویستی رووداوەكان ناكا. بەڵكوو لە ئاستەكانی ژێرین و شاراوەیدا، خەریكی خەملاندن و رەنگاندنی كروتەونی جوانكارانەی خوی دەبێ و بەم چەشنە رادەی ئەدەبییەتی خۆی بەرز دەكاتەوە.

ئەوە بەهارێكم گەیوەتێ
بەهارێكی لە ناكاوێ
عەبدولعەزیزە كوڕەی داسنی دەڵێ
دوێنێ بەیانی دەستم دەداوە شینكێ چەخماخ خواری گەرروومار
رووم دەكردەوە چیایە مەغلووبێ داسنی‌یان بەبیانووی راوێ
كاكینە ئەمن تەقەم دەهاتەوە لە تفەنگێ، بە خوای كزەم دەهاتەوە لە هەناوێ
لینگم دەداوە وەمدەزانی نێرییە كێویە
نەمدەزانی كاكە سەیدەوانەم دەكەوتەوە دەگۆمیلكە گۆمیلكەی دەخوێناوێ...
ئەمن بۆت هەڵدەڵێم بە دەزگیرانی كاكە سەیدەوانێ
سەری هەڵنایە لەبەر شەدەلێدانێ
شەرت بێ لە پاش مەلكەوان و نێوچیرەوان و سەیدەوانێ
چیایە مەغلووبی داسنیان لە خۆ حەرام كەم
بە حەزمێ راوێ تفەنگێ نەكەمەوە دە شانێ[١٤]

ئەم نوسخەیەی بەیتی سەیدەوان، بە مەزەندە لە سەد دێڕ پێك هاتووە. تەواوی دێڕەكان، راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ، دووپاتەی مەبەستی ئەو دێڕانە دەكەن كە لە سەرەوەدا وەكوو دەقی نموونە نووسراوەتنەوەو بە شێوەیەكی تیشك هاوێژ و برووسكەیی چۆنیەتی رووداوەكە، وێڕای نێوی كەسایەتییەكان

(عەبدولعەزیزی داسنی و سەیدەوان و نیچیروان و مەلکەوان) و شوێنی رووداوەکە ( چیای مەغلّووبی داسنیان) باس دەکەن.

کورتکردنەوەی زنجیرەی هاونشینی، خۆیلەخۆیدا، نابێتە هۆی ژێرکەوتنی مەنتیقی مەجازی و سەرکەوتنی مەنتیقی خوازەیی. بەلکوو ئەو رەوتە، هاورێ لەگەلّ رووداانی هێندەك ئالّ و گۆڕیتر، وەکوو بەرجەستە بوونی تایبەتمەندییەکانی رۆمانتیکی دەق، یان نزیك بوونەوە لەسروشتی «ناتەواویی گێڕانەوە» کە تایبەتە بە ئوستوورە، بەرەبەرە ئالآی سروشتی خوازەیی لەدەقدا، بەرز دەکەنەوە.

ناتەواوی گێڕانەوە، لە هێندەك بەیتدا، هەلگری سروشتێکی وەك دەقی ئوستوورەیە. «لیڤی شتراوس»دەلێ،هەرچی ئوستوورەیە لە سەر گێڕانەوەیەکی ناتەواو، دامەزراوە. هەر بۆیە سەبارەت بە ئوستوورە، گەڕان بە دوای ریوایەتی تەواو و پشتپێبەستراو یان «نووسخەیەکی سەرەکی» بۆ ئەو ئوستوورە تایبەتە، کارێکی بێ کەلّك و ناراستە. شتراوس بە بەلگەهێنانەوە لە بۆچوونی مرۆڤناسێکی ئەمریکایی، دەلێ ئوستورەکانی سوورپێستان، هەر جار کە دەگێڕدرێنەوە، دەبن بەئوستوورەیەکی تازە و سوورپێستەکانیش ئەو گێڕانەوە تازەیە، وەکوو گێڕانەوەکانی پێشوو قەبووڵ دەکەن. شتراوس بۆ پاساودانی ئەو جیاوازییانە لە نێوان گێڕانەوەکانی جیاجیای یەك ئوستوورەدا، دەلێ: کاتێك رووداوێکی مێژوویی کە لە ولآتێکی دیاریکراو و لەدەورانێکی دیاریکراو دا قەوماوە، لە هەر گێڕانەوەیەکدا بە چەشنێك بە دیار دەکەوێ کە لەگەلّ گێڕانەوەکەی پێشوو، جیاوازی هەیە، شتێکی سەیرنیە ئەگەر چەند گێڕانەوەی یەك ئوستوورە، لێك جیاواز بن.

بەیت ئوستوورە نیە، بەلآم لەم بارەیەدا، تارادەیەك، لەگەلّ ئوستوورە خاوەنی تایبەتمەندیەکی هاوبەشە. سروشتی ناتەواویی گێڕانەوە، لە هێندەك

بەیتدا. زۆر و کەم وە بەرچاو دەکەوێ و بەم شێوەیە لەم بەیتانەدا، دیاردەی لادان لە مەنتیقی مەجازی دەکەوێتە بەر چاو.

سمکۆی شکاک:

بەلێ گولیزاری بانگی کردێ موحتەبەرێ نایی و خۆشکێ من نایێ
ئەمێ دوعایەکێ بکەین یا وەللاٚ یا غەوسی مالێ لە بەغدایێ
جارێ وی‌جار بابی خەسرۆ قوتاربکەی ل وێ بەلاٚیێ
ئای دا میرات نەمینێ دەشتێ سۆمایێ
بەلێ گولیزارێ بانگ کردێ موحتەبەرێ بەلێ شەرەکێ داکەتە
جادەیا شنۆیا رەنگین، دنسارێ بەلێ دگەوارینا هێوارێ [١٥]

هەر بەم پێیە دەتوانین دابەشکردنێك لەناو بەیتەکاندا بکەین و دوو دەستە بەیت، لێك جیاکەینەوە:

**ئەلف** ـ ئەو بەیتانەی تێیاندا هێڵی گێڕانەوە لەبەر یەك دەکێشرێتەوە و یەکەکانی گێڕانەوە یەك لەدوای یەك لە ناو بەیتدا ئامادەن و هەر بۆیەش مەنتیقێکی مەجازییان هەیە.

ب ـ ئەو بەیتانەی ئاماژە بە چیرۆکێکی تایبەتی دەکەن، بەڵام چیرۆکەکە لە ناو بەیتدا ئامادە نیە و لە پشتیدا خۆی شاردۆتەوە و خوێنەر یان بیسەر دەبێ بۆ زانینی چۆنیەتی رووداوەکان، پشت بە روونکردنەوەکانی دەرەوەی بەیت ببەستێ. لێرەدایە کە بۆچوونی ئەو کەسانەی پێیان وایە بەیت شتێك نیە جگە لەحەکایەتێکی فۆلکلۆری، بناغەکەی دەرووخێ. چوونکە مەنتیق و پێکهاتەی زاڵ بە سەر ئەم بەیتانەی دەستەی دووهەم، بە شێوەیەکی بنچینەیی، لەگەڵ مەنتیق و پێکهاتەی چیرۆك جیاوازی هەیە.

لە فەسڵی پێشوودا گوتمان هاونشینی ماکەکان لەناو بەیتدا بەشێوەی (نزا و پارانەوە + **گێڕانەوە + رۆرۆ**) وەبەرچاو دەکەوێ. دیارە چونکە لە بەیتەکانی دەستەی دووهەمدا، ئاڵقەی ناوەندی واتە گێڕانەوە دەگاتە ئەو پەڕی

کاڵ بوونی خۆی کەواتە دوو ئاڵقەی دی، بەهێزتر دەبن و بۆ دەورگێڕان، هەڵسووڕتر دەبن.

بۆ نموونە دەبینین بەیتی کانەبی، بریتییە لە شینی ژنی کانەبی بۆ مێردەکەی. (واتە بەهێز بوونی ئاڵقەی ڕۆرۆ) بەیتی زەینەڵ و گوزەل، شینی گوزەڵ بۆ براکەیەتی. سەیدەوان، شینی عەبدولعەزیز بۆ کوڕەکانێتی.

بەیتەکانی دەستەی یەکەم، لەپێکهاتەی تەواوعەیاری بەیت نزیکترن* و بەیتەکانی دەستەی دووهەم، بەرەبەرە لە چوارچێوەی پێکهاتەیی حەیران نزیك دەبنەوە. لە هەر دوو دەستەدا دەتوانین بە ناو ئاماژە بەهێندەك نموونە بکەین:

**دەستەی یەکەم:** دمدم، قەروگوڵەزەر، غەزای سیسەبان، قۆچ عوسمان، خەج و سیامەند.

**دەستەی دووهەم:** کانەبی، ئەحمەدی شەنگ، لەشکری، سەیدەوان، کاکەمیر و کاکە شێخ.

لێرەدا، پێویستە ئاماژە بەم خاڵە بکەین کە ئەگەرچی ئیرجاع بۆ سەرچاوە مێژوویییەکان، بۆ تێگەیشتنی ڕووداوی بەیت، لە جێی خۆیدا پێویستە، بەلام لە خوێندنەوەیەکی ئەدەبیدا، بەرتەسك کردنەوەی بەیت هێندەی ڕاپۆرتێکی مێژوویی، ئەدەبییەتی دەقی بەیت، پێشێل دەکا. هەڵسەنگاندنی بەردەوامی دەقی بەیت لەگەڵ ڕاپۆرتە مێژوویییەکان، دەبێتە هوی بەرتەسك بوونەوەی مەیدانی ڕاڤەکانی ئازاد و داهێنەرانەی خوێنەر. ئەو پێوانەیەی دەبێ سەبارەت بە دەقی بەیت دەکار بکرێ، ڕادەی تەبا بوونی لەگەڵ مێژوو نیە بەڵکوو ڕادەی بەرزی ئەدەبییەت لە ناو دەقدایە.

---

* بڕوانە فەسڵی چوار

### ٣ـ خۆماڵی کردنی بەیت

کورد، بۆ ڕۆنان و فۆرم دان بە ژانری بەیت، لە چێژ و هەست و بیر و جیهانبینی خۆی کەڵکی وەرگرتووە. بە قیاس لەگەڵ ئەو بۆچوونە کە دەڵێ: ڕۆمان کەرەستەیەك بووە بۆ ئەوەی کۆمەڵی بورژوای ڕۆژئاوا، خۆی پێ بەیان ـ بکا، دەتوانین بەمتمانەوە بڵێین کە بەیت کەرەستەیەك بووە بۆ ئەوەی کۆمەڵی کوردەواری خۆی پێ دەربڕێ. چۆن دەبێ ناوی شوێنەکانی کوردستان تێکەڵ بەدەقی بەیت کرابن بەڵام زەوقی جوانی ناسانەی کورد، لەناو بەیتدا ریشەی دانەکوتابێ.

دیاری کردنی بەیت وەکوو ژانر بەم مانایەیە کە هەرێمێکی تایبەت لە پانتای زمانی کوردیدا، بە یاساورێسای تایبەت بە خۆیەوە هەیە کە بەیت بێژی کورد لە کاتی بەرهەم هێنانی بەیتدا، خۆی پێی زانیبێ یان پێی نەزانیبێ، لە ناو ئەو هەرێمەدا و بە پێی ڕێسا و یاسای باوی بەیتەکانی پێش خۆی، بەیتی تازەی گوتووە.

کەواتە دەسنیشان کردنی بەیت وەکوو ژانرێك، بەم مانایە نیە کە هەموو گەلانی دنیا بە شێوەیەکی وێکچوو، ئەدەبی فولکلۆری خۆیان پێك هێناوە و کوردیش بە شێوەیەکی تری تایبەت بە خۆی ئەم کارەی ڕاپەڕاندووە.مەبەست ئەوەیە دووپاتبوونەوەی چەشنە بەرهەمێکی فۆلکلۆری، بەرەبەرە بۆتە هۆی چەسپانی کۆمەڵە ڕێسایەك و پێك هاتنی چوارچێوەیەکی تایبەت کە بکرێ ناوی ڕێساکانی ژانری لە سەر دابنرێ. ئەو شێوەیە بۆ شەقڵ گرتنی چوارچێوەیەکی دەستنیشانکراو لە ناو ئەدەبی هەموو گەلێکدا دەتوانێ وەراست بگەڕێ و تایبەت بە کورد نیە. ئەو ژانرە جیاوازانە لەئەدەبی گەلانی جیهاندا، لەبەر ئەوەی هەموویان سەر بە ئەدەبی فولکلۆری و زارەکین خاڵی هاوبەشیان هەیە بەڵام هەر جۆرێکی تایبەتی، لە ناو زمان و ناوچە و خەڵکی خویدا، بەرەبەرە

بۆلای خۆماڵی بوون و خۆجێیی‌بوون ڕۆیشتووە و ئەو خۆمالی بوونە هەر بەتەنیا لەناوەڕۆکدا ڕووی نەداوە بەڵکوو فۆرمیشی گرتۆتەوە. ئەم پرۆسەی خۆماڵی بوونە لە بەیتیشدا ڕوویداوە. کەواتە لەم لێکۆڵینەوەیەدا، بەربڵاویی چەمکی ژانرمان بارتەقای ئەوە داناوە کە ئەم دووتایبەتمەندییەی خوارەوەی هەبێ:

١ـ هەرێمێکی ڕێسایی تایبەت بە خۆی هەبێ.

٢ـ لە ناو ئەم چوارچێوە ڕێساییەدا، بکرێ بە شێوەیەکی چەند پاتەکراو، نموونەی جیاجیا بەرهەم بێ.

پرۆسەی خۆماڵیکردنی بەیت، چۆن و بە چ کەرەستەگەلێکەوە جێبەجێ کراوە؟ ئەگەر بڵێین ڕۆمان و کورتە چیرۆك و زۆر ژانری ئەدەبیتر کە ئێستا کورد فێریان بووە و بە کاریان دێنێ، لە گەڕیانی شوێن وەرگرتنێکی ئیجابی فەرهەنگیدا وەرگیراون و بۆخۆی داینەهێناون، بەڵام ژانرێکی تایبەتی بە ناوی بەیتی بە شێوەی خوی داهێناوە و ئەو تەونە، بەرهەمێکی خۆماڵی‌یە، بەپێی چ بەڵگەیەکەوە دەتوانین ئەو داوایانە بسەلمێنن؟

وەڵامی ئەو پرسیارە، بەم شێوەیە گەڵاڵەدەکرێ کە بەیت خاوەنی پێکهاتەیەکی ئەوتۆیە کە لە چەند فازی جیاوازدا، پرۆسەی خۆماڵیکردنی لە سەر پیادەکراوە. لە قۆناخی یەکەمدا کارکراوەتە سەر بناغەی پێکهاتەی بەیت. لە قۆناخی دووهەمدا چینی ناونجی کاری لە سەر کراوە و لە قۆناخی سێهەمدا، ڕواڵەتی زمانیی بەیت، بەچەشنێکی تایبەتی، فۆرمی پێ دراوە.

**قۆناخی یەکەم:** چۆنیەتی یەکانگیری ماکەکانی پێکهێنەری بەیت.

ئایا قەوارەبەندی کۆمەڵایەتی‌کورد، لەو جێگایانەدا کە لەگەڵ قەوارەبەندی کۆمەڵایەتی گەلانی‌تر، جیاوازی هەیە، بۆ چنینی کروتەونی بەیتی کوردی،کاری‌کردۆتە سەر پێکهاتنی مۆدێلی(ڕەگەزی شیعری + ڕەگەزی چیرۆك + ڕەگەزی درامایی) ؟ بە واتایەکی‌تر ئایا دەکرێ بڵێین ئەگەر کورد خاوەنی

قەوارەبەندیەکی کۆمەڵایەتی جیاواز لەوەی خۆی بوایە،مۆدێلی بۆنیادی بەیتیش گۆڕانی بەسەردا دەهات؟ ئایا ئەو ئایدولۆژیانەی، کورد جیهانی پێ تەجرەبە کردوون، کاری کردۆتە سەر ئەو ژانرە داهێنراوەی خۆی؟ پرسیارێکی لەمانەش بنەڕەتی‌تر ئەوەیە کە ئایا ئەسڵەن لە چوارچێوەی بابەتێکی مەیلەو پێکهاتەخوازانەدا، باسی شوێن‌دانانی قەوارەبەندی کۆمەڵایەتی و ئایدۆلۆژی لەسەر دەقێکی تایبەتیدا، باسێکی بەجێیە؟

با وەڵامی ئەم پرسیارەی دوایی، لە نووسەری کتێبی«عمل نقد» بخوازین:

«گەرچی نیشانەکان بە تەنیا خاوەنی سروشتێکی دڵخوازانەن، بەڵام نیزامەکانی دەلالەتی، بە شێوەی گشتی بەم چەشنە نین. مانا مەبەستێکی تاکەکەسی نیە. بەڵکو بەرهەمی تێگەیشتنی دوو لایەنەی نێوان مرۆڤەکانە. بەواتایەکی‌تر مانا بەشێوەیەکی کۆمەڵایەتی دروست دەبێ. کەواتە بونیادی کۆمەڵایەتی نیزامی دەلالەتی لەگەڵ قەوارەبەندی کۆمەڵایەتی پێوەندیەکی نزیکی هەیە.

هەر لە سەر بناغەی کاری سۆسۆر، دەکرێ بەم شێوەیە بەڵگە بێنینەوە کە تا ئەو جێگایەی زمان وەکوو شێوەیەك بۆ دەربرینی ئەزموون، چاوی لێدەکرێ، بەناچار کاردەکاتە سەر ئایدۆلۆژی. مەبەستمان لە ئایدۆلۆژی بریتیە لەو کۆمەڵە شێوازەی خەڵك بۆ ژیان، ڕەچاویان دەکەن و پێوەندییەکانیان لەگەڵ چۆنیەتی بوونی خۆیان تەجرەبە و بەیان-دەکەن. ئایدۆلۆژی لە ناو کردەوەی دەلالەتی و گوتار و ئوستوورە و چۆنیەتی نیشاندانی «بوونی شتەکان»دا هەڵکەندراوە. کەواتە دەکرێ بڵێین ئایدۆلۆژی لە زماندا هەڵکەندراوە»[١٦]

دەکرێ بڵێین ئامادەبوونی ڕەگەزەکانی بەهێزی درامایی لە ناو بەیتدا، ئاکامی شوێندانانی ڕاستەوخۆی ئەو قەوارەبەندییە تایبەتە بووە کە لە کۆمەڵی کوردەواری سەدەکانی پێشوودا هەبووە. داب و نەریت و خوو و خدە و بیر و باوەڕی ناو کۆمەڵ لە زۆر بۆنەی جیاوازدا، دەرەتانی بەرەوڕووبوونەوەی دوویەدووی کوڕ و کچی پێك هێناوە. گەڕی ڕەشبەڵەك، ژووانی نهێنی و نیوەنهێنی، سەرکانی، بەربێر و زۆر هەڵکەوتی‌تر، بە کردەوە کوڕ و کچیان کردووە بە دوو لایەنی وت و وێژێکی ئەویندارانە و مۆدێلی (کوڕ دەڵێ - کچ

دەڵێ) کە لە دەقە فۆلکلۆرییەکاندا دێتە بەرچاو، نموونە هەڵگرتنەوەیەکە لەو نەریتە کۆمەڵایەتییانەی ژیانی کورد. تەنانەت لە باڵۆرەدا، کوڕ و کچ زۆر رووهەڵماڵاوانەتر، یەکتریان دوواندووە. ئەگەر چۆنیەتی پێوەندی نێوان کوڕ و کچ، لە ناو کوردیشدا، وەك لەناو هێندەك گەلی دراوسێماندا بە دیار دەکەوێ، بەپێی دابەکانی عورف و بڕواکانی شەرعی، پێوەندیەکی زۆر بەرتەسك و قەدەغەکراو بوایە، دەرەتانی ئەو نموونەهەڵگرتنەوەیە نەدەرەخسا و بێ شك، بۆنیادی بەیتی کوردی بەم چەشنەی ئێستا نەدەبوو.بەم چەشنە، تەوەرەی ناوەندی بەیت کە بریتی‌یە لە رەگەزی چیرۆك، یەکەمین هەڵبژاردنی خۆی لەناو رەگەزەکانی دراماییدا بەئەنجام دەگەیەنێ. بەڵام ئەم تەوەرەیە دووهەمین هەڵبژادرنی خۆشی، لە ناو رەگەزەکانی شێعری بە رێوەدەبا. ئەم هەڵبژاردنەش لە دۆخی تایبەتی ژیانی کورد، لە سەردەمی ئاژەڵداری و کشتوکاڵدا، لەکاتی نزم بوونی رێژەی خوێندەواری لە ناوکۆمەڵدا سەرچاوەی گرتووە. لە کۆمەڵگای نەخوێنەواردا، پەیڤی غەیرە شێعر دەرەتانی بڵاوبوونەوەی بۆ نەبووە و برەوی شێعر زورتر بووە.

**قۆناخی دووهەم:**

**شێعری وتاری و بردنە سەری رێژەی خۆماڵی بوونی بەیت.**

دەتوانین لەناو بەیتی کوردیدا، بە شوێن ماکەی ئەوتۆدا بگەڕێین کە سەداوسەد تایبەت بەکورد بن. دیارە ئەو عونسورانە لەناو کروتەونی زمانیی بەیتدا دەدۆزرێنەوە. لە بەشەکانی پێشوودا، لە زمانی سوارە ئیلخانی‌زادەوە، چەند شێوازی شێعریمان لە بەستێنی ئەدەبی کۆنی کوردیدا، لێك جیا کردەوە کە بریتین لە: شێعری وتاری، شێعری بڕگەیی و شێعری عەرووزی. شێعری وتاری و شێعری بڕگەیی، هەر دووك کەڵکیان لەکێشەکانی خۆماڵی وەرگرتووە، بەڵام ئاستی خۆماڵی بوونی شێعری وتاری، پلەیەك لە هی شێعری بڕگەیی لەسەرترە.

نموونەی شێعری برگەیی، پتر لە گۆرانییە رەسەنەکانی کوردیدا بەدی دەکرێ. لەدەقی بەیتیشدا، پتر شێوازی شێعری وتاری دەکارکراوە و هێندەکجار نموونەی شێعری برگەییش، لەناو بەیتدا دەکەوێتە بەرچاو.

شێعری برگەیی لە گۆرانی و هەڵبەستی کوردیدا:

هەی‌نار هەی نار باوانم یار  هات و رۆیی بە لەنجەولار
زولفت بەرێز بەردانـــەوە  بە بای عیشوە دەخولانەوە
کۆنەبرینم دەکولانەوە
دیسان شەو هات بۆ حاڵی من  بۆ دڵـەکەی پڕ خەیـــاڵی من
عالەم سووتا لەناڵەی من[17]

شێعری وتاری لە بەیتدا:

| | |
|---|---|
| ئامۆزا خەجێ دەیداوە لە بانگێ دەیگوت | ١٣ برگە |
| ئامۆزا سیامەند گیان ئەمن بۆت هەڵدەڵێمەوە بەرێزی دەکێلەسییانە | ٢٣ برگە |
| ئەوە پێشی لە من بەچۆم و بە تات و بە ئاوە | ١٥ برگە |
| لێی دەخوێنن شەهێن و شمقار دەگەڵ تەرلانە | ١٤ برگە |
| ئامۆزا سیامەند گیان سەد بریا لە بریایە خودای | ١٥ برگە |
| ئەتۆ نەخۆشم بای لەرێزەی هەموو نەخۆشانە | ١٥ برگە |
| لەگەرقەومەکەست لێدەهالان،برووکەبرووکەم ئاوبەزاریدادەکردی[18] | ٢٢ برگە |

شێعری برگەیی لە بەیتدا:

| | |
|---|---|
| پرسیم بو دەگری ئەی عەمرو چاوم ئەی کیژە جوانێ | (٥ + ٥ + ٥) برگە |
| دەڵێ: | |
| کراسم نیە بچمە دیلانی | (٥ + ٥) |
| دەڵێم: | |
| بینانی چاوم، گەوهەر و دورم | (٥ + ٥) |
| من باڵدار نەبووم بە باڵان بفرم | (٥ + ٥) |
| محەندەک نەبووم بە خۆم بخورم | (٥ + ٥) |
| بچمە میسر و شام، کراسێک بکرم[19] | (٥ + ٥) |

شێعری وتاری و شێعری بڕگەیی، بە تەواوی لەگەڵ پێکهاتەی ڕێزمانی زمانی کوردی ڕێکن. جگە لەمە، سروشتی شێعری گوتاری، بۆ گێڕانەوە و بۆ شین و ڕۆڕۆ، زۆر لەبارە. سوارە، لە بارەی شێعری عەرووزییەوە دەڵێ:

«زمانی کوردی بۆ دەکارکردنی بەحرەکانی شێعری عەرووزی، ناتوانێ دەورێکی چالاکانە بگێڕێ. چونکە ئەو بەحرانە، بە پێی سروشتی تایبەتی و پێکهاتەی ڕێزمانی زمانی عەرەبییەوە پێك هاتوون. فارسەکانیش کە ئەو بەحرە عەرووزییانەیان وەرگرت، بەرەبەرە بە درێژایی ماوەیەکی نزیك بە هەزار ساڵ بە پێی قالبی سروشتی زمانی خۆیان، بەحرەکانیان داتاشی و پێیان داچوونەوە و گۆڕانیان بە سەر دامێنان»[٢٠]

بەڵام شێوازی شێعری وتاری، بە پێچەوانەی شێعری عەرووزی بە پێی داخوازی سروشتی تایبەتی زمانی کوردی بووە.واتە شێعری وتاری یان بەیتی، لە سەر بناغەی هەمان ئەو بەڵگەیە، کە لەخوار بوونی ڕێژەی خۆماڵی بوونی شێعری عەرووزیشی پێ ئیسپات کراوە، ڕێژەی خۆماڵی بوونی لە سەرترە.

**قوناخی سێهەم ـ هەڵبژاردنی زاراوەکانی ناوین.**

بە ورد بوونەوە لە زاراوەی بە کار هێنراو لەو دەقانەی تایبەت بە ناوچەی موکریانن خاڵێکی زۆر بەرچاو، سەرنجمان ڕادەکێشێ. دەقی بەیت لە باری موفرەداتەوە، دارماڵە لەو وشە ڕەسەنانە کە پتر تایبەتن بە زاراوەی ناوچەی موکریانی ناوەندی(واتە مەهاباد و بۆکان و میاندواو) بەڵام لە باری سینتاکس و پێکهاتەی ڕێزمانییەوە، مۆدێلێك کە دەقی بەیت پەیڕەوی لێ دەکا، ئەو شێوە ڕێزمانییەیە کە تایبەت بە دیالێکتی باوی باکووریترین ناوچەی موکریان واتەی ناوچەی شنۆ یان هەمان ئەو مەڵبەندەیە کە سنووری نێوان دوو دیالێکتی سەرەکی کوردی (کرمانجی ناوەراست و کرمانجی سەروو)ـ ی لێهەڵکەوتووە.ئەم بارودۆخە سنوورییە و چۆنیەتی شوێندانانی ئەو دوو زاراوە سەرەکییە لە سەر یەکتر، بۆتە هۆی ئەوەی دیالێکتی تایبەت بەم ناوچەیە، جیاوازی لەگەڵ زاراوەی باوی موکریان هەبێ.

بە سەرنجدان بەتێکستی حەیرانەکانی ناوچەی هەولێریش، دەبینین ئەو هەڵبژاردنە ناوینە کە لە ناو دوو زاراوەی سەرەکی کوردی بەڕێوەچووە لەوانیشدا بەر چاو دەکەوێ. لە هێندەك دەقی بەیت و باودا، تەنانەت داوەری کردن لەم بارەیەدا کە زاراوەی بە کارهێنراو لەناو تێکستدا، دەکەوێتە خانەی زاراوەی کرمانجی ناوەراست یان کرمانجی سەروو، یەکجار زۆر دژوارە.

لەم زەمینەیەدا رەوتی خۆماڵی کردنی بەیت، نەك هەر لە قۆناخی بەرهەم هێنانی بەڵکوو لە قۆناخی بڵاوکردنەوەشیدا، دەوری گێڕاوەو هەڵکەوتنی جوغرافیایی ناوچەکانی کوردستان و رێژەی بەرزی ئاخێوەرانی کورد کە بەدوو زاراوەی سەرەکی قسەدەکەن، شوێنیان داناوەتە سەر پێکهاتەی رێزمانی بەیت. بە واتایەکی‌تر ئەگەر هەڵکەوتنی جوغرافیایی ناوچەکانی کوردستـــــان و بڵاوبوونەوەی ئینسانی ئاخێوەرانـــــی ســـــەر بە دیالێکتـــــە جیاوازەکان، بەشێوەیەکی‌تر بوایە، پێکهاتەی رێزمانی بەیتیش بەم شێوەیە نەدەبوو کەئێستا هەیە.

## پاشکۆ

### هەڵبژاردنی بەیت وەکوو بابەتی خودی بەیت

جێی خۆیەتی لە کۆتایی ئەم فەسڵەدا، خاڵێکی سەرنج راکێش لەبارەی بابەتی هێندەك لە بەیتەکان، بخەینە بەرباس.بەیتناسان لە سەر ئەوە رێك کەوتوون کە بابەتی بەیتەکان، بریتین لە یەکێك لە بابەتەکانی: مێژوویی (وەکوو دمدم)، ئەوین و دڵداری (وەکوو مەم و زین) بابەتی ئایینی(وەکوو بەیتی قەبران) و...

جوانکارییەك کە لە پانتای بەیتدا کراوە، هەڵبژاردنی خودی بەیت یان بەیت بێژ، وەکوو بابەتی بەیت بووە.

لە هونەری سینەمادا، دیتوومانە کە لە هێندەك فیلمی هونەریدا، خودی سینەما، بۆتە سووژەی فیلم. هاوچەشنی ئەم ڕووداوە، کاتێك لە بەستێنی بەیتدا ڕوویداوەکەبەیتبێژ بەگرینگایەتی ئەو بەشە لە فولکلۆری کوردی زانیوە.

بۆ نموونەچۆنیەتی میوانبوونی هەڵکەتی و خڕناڵ، لە وسوو شایەر بۆ فێربوونی بەیتی سوڵتان ئەحمەدی بێناریێ، وەکوو بەیتێکی کورت و گردوکۆ، لە سەر زاری بەیت بێژانەوە بووە. کورتەی ئەو بەیتە، بەم چەشنەیە:

هەڵکەتی و خڕناڵ بەیت بێژی مەجید خانی بوون. ئەوان هیچیان بەیتی سوڵتان ئەحمەدی بێناریێان نەدەزانی. مەجید خان کوتی دەبێ بچن لە هەر کوێیەکی هەیە، بەیتی سوڵتان ئەحمەدی بێناریم بۆ وەدەست خەن. برایمی کامەلا کوتی وسووشایەر هەیە لە شنۆیە، بەیتی سوڵتان ئەحمەدی دەزانێ. هەڵکەتی و خڕناڵ و سوو شایەر دەدۆزنەوە و پێی دەڵێن:

پیاوێکی بە جەوهەری / زۆر مەرد و موزەفەری

نەرمی هەر دەڵێی فەنەری / پێم وایە تۆ وسووشایەری

ئێک بازین ئێک سەفەرین / لە بەر وەستادت دەمرین

دەردمان بە کەس چاری نایە / بە تۆ هەڵ دەکرێ ئەو چرایە

و سوو شایەر دەڵێ:

ئەگەر دەپرسن بە ئەسەحییە / بەیتی سوڵتان ئەحمەدی بێناریێ لەکنەمنە

بە مورەتەبی‌یە / پاش و پێشی بەیتم نیە

ئەمن مەلام دانامێنم / لەو بەیتەو چاك بۆ دەخوێنم

وسووشایەر کوتی شەوێ هەتا چرانەکوژێتەوە، پێو نالێم. جا شەوێ ئەگەر چرا کوژاوە، بەیتەکەی پێ کوتن. بە چوار شەوان بۆی تەواو کردن ئەگەر بەیتەکە تەواو بوو، لێی پرسینەوە. بیست و هەشت بەندیان لێ زیاد کردبوو.زۆریش بەرێ و جێ لێیان زیادکردـ بوو. وسووشایەر ئەگەر وای دی زۆری پێ خۆش بوو. کوتی هەك لە چاوی منو کەوێ.[٢١]

لە کۆتایـــی ئەم فەسلەشـــدا، با پوختـــەی باســـەکە، لەهێلکاری ژمارە٤دا بخەینەڕوو:

هێڵکاری ژمارە ٤

## پەراوێزەکان


١. بابک احمدی ـ ساختار و تأویل متن ـ تهران ـ نشر مرکز ـ چاپ چهارم، ١٣٧٨ ـ ٢٨٧

٢. گۆڤاری سروه ـ ژماره ١ ـ ل ٩٠

٣. ئەحمەد بەحری ـ گەنجی سەربەمۆر ـ سلێمانی ـ پەخشی سەردەم ـ چاپی یەکەم ـ ٢٠٠٠ ل ١٦٢

٤. هەمان سەرچاوە ـ ل١٦٨

٥. ئۆسکارمان ـ تحفهٔ مظفریه — پێشەکی و ساخکردنەوە وهێنانە سەر رێنووسی کوردی: هێمن ـ مەهاباد ـ چاپخانەی سەیدیان ـ ١٣٦٤ ـ ل ٢٩٧

٦. تەنانەت من خۆم پایزەم بەزاراوەی کرمانجی سەروو لە ناوچەی شنۆ بیستووە.

٧. س. و. داوسن — درام ترجمه فیروزهٔ مهاجر ـ تهران نشر مرکز ـ چاپ اول ١٣٧٧ ـ ص ۴۶

٨. یاسین حەسەن گۆران ـ لاوك وسترانی کوردواری ـ هەولێر ـ چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری ـ چاپی یەکەم ـ ١٩٩٨ ـ ل ١٢٩

٩. هەمان سەرچاوە ـ ل ١٧٧

١٠. سوارە ئیلخانیزادە ـ تاپۆ و بوومەلێڵ ـ تاران ـ بڵاوکەرەوەی پانیز ـ چاپی یەکەم ١٣٧٩ ـ ل ٢٣٣

١١. ئیبراهیم تەقی سوڵتانی ـ بەیتی فەقێی گوڤاری سروە ـ ژمارە ١٣٨ . ل ٤٦

١٢. خ ـ ساڵح ـ بەیتا کەوا ـ گۆڤاری سروە ـ ژمارە ١٧ ـ ل ١٨

١٣. رابرت اسکولز ـ درآمدی بر ساختارگرایی در ادبیات ـ ترجمه فرزانه طاهری ـ تهران انتشارات آگه ـ چاپ اول ـ ١٣٧٩ . ص ۴١

١٤. گۆڤاری سروە ـ ژمارە ٥ ـ سەیدەوان ـ ل ٢٣

١٥. یاسین حەسەن گۆران ـ لاوك وسترانی کوردواری ـ هەولێر ـ چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری ـ چاپی یەکەم ـ ١٩٩٨ ـ ل ٧٣

١۶. کاترین بلزی ـ عمل نقد ـ ترجمه عباس مخبر ـ تهران، نشرقصه چاپ اول ١٣٧٩ ـ ص ۶٣

١٧. باکووری ـ گۆرانی بێژە نەمرەکان ـ بەشی یەکەم ـ هەولێر ـ چاپخانەی وەزارتی پەروەردە ـ چاپی یەکەم ـ ٢٠٠١ ل ٩٨

١٨. ئەحمەد بەحری ـ گەنجی سەریەمۆر – سلێمانی ـ پەخشی سەردەم ـ چاپی یەكەم ـ ٢٠٠٠ ل ٣٠٩

١٩. مەحموود شكاكنژاد ـ بەیتی خەزیم ـ گۆڤاری سروە ـ ژمارە ١٣٩ ـ ل ٣٤

٢٠. سوارەئیلخانیزادە ـ تاپۆ و بوومە لێل ـ تاران ـ بلاوكەرەوەی پانیز ـ چاپی یەكەم ١٣٧٩ لل ٥٢ – ٢٣٩

٢١ قادر فتاحی قاضی شۆڕەمەحموود ومەرزینگان ـ تبریز ـ انتشارات دانشكدهٔ ادبیات و علوم انسانی ـ چاپ اول ١٣٤٨ ـ صص ٤ ـ ١٢

تا ئێستا قسەمان لە وێکچوون و جیاوازی فۆرمە جۆراوجۆرەکانی بەیت کردووە. دەتوانین لەم بەشەدا، تەواوی ئەو پێکهاتانە، بە هەموو تایبەتمەندییەکانیانەوە، لە پۆلێن کردنێکدا پێکەوە کۆکەینەوە.

ئەم پێکهاتە جیاوازانە، جگە لەوەی لە باری چوار چێوەوە، خاڵی هاوبەش و جیاوازیان هەیە، لە باری وردە ڕێساکانیشەوە، دەکرێ پێکەوە هەڵبسەنگێندرێن.جارێ پۆلێنکردنەکەمان، لەسەر بناغەی تایبەتمەندییە گشتیەکان دادەمەزرێنین و دواتر هەر لەم فەسڵەدا، ئاوڕێك وەسەر وێکچوون و جیاوازی وردە ڕێساکانی ناو دەقەکانیش دەدەینەوە. بەگوێرەی باس و خواسەکانی پێشوو، حەوت پێکهاتەی جیاواز لە پانتای بەیت و باویدا لێکجیا-دەکرێنەوە. دیارە ئەو ناوانەی لەم لێکۆلینەوەدا بۆ ئەو حەوت دەستەیە دانراون، بە شێوەیەکی قەراردادی هەڵبژێردراون.

**١- بەیت بە پێکهاتەی تەواو عەیارەوە.** ئەم چەشنە بەیتە بەو تایبەتمەندییانەی‌خوارەوەدەناسرێتەوە:

١-١ هەر سێ ڕەگەزی چیرۆکی و شێعری و درامایی تێدا ئامادەیە و ڕەگەزی چیرۆك لە ناو ئەو سێ ئاڵقانەدا، ئاڵقەی ناوەندی پێك دێنێ.

١.٢ لە هەردوو بەشی تەخت و بەند پێك هاتووە و بەشی بەندیشی بە شێعری وتاری هەڵچنراوە نەك بە شێعری مەنزوومەیی.

١.٣ مەنتیقێکی مەجازی بە سەردا زاڵە.

١ـ ٤ لە بەر ئەوەی هێڵی گێڕانەوە، تێیدا لە بەر یەك کێشراوەتەوە و یەکەکانی گێڕانەوە، یەلەبەدوای یەکدا هاتوون، پشت بەستن بە سەرچاوەیەکی دەرەوەی بەیت پێویست نیە.

نموونە: سەعید و میرسێوەدینبەگ، لاس و خەزاڵ، مەم و زین، گەنج خەلیل، برایمۆك، شێخ فەرخ و خاتوون ئەستی، ناسر و ماڵ ماڵ، مەحمەڵ و برایمی دەشتیان، شۆڕمەحموود و مەرزنیگان و جۆڵندی[1].

٢ـ بەیتی مەیلەو تەواو عەیار.

ئەم بەیتانە هەریەتەنیا لە تایبەتمەندی دووهەمی بەیتەکانی تەواو عەیاردا، لێیان جیــادەبنەوە، واتە بەشــی تەختیان نیە و لە سێ خەسڵەتەکەیتردا (١ـ١، ١ـ٢، ١ـ٤) لەگەڵیان هاوبەشن.

ئەم دەستەیە، ئەو بەیتانە دادەگرێ کە لە فەسڵی پێشوو، لە بەشی لادان لە مەنتیقی مەجازیدا وەکوو دەستەی یەکەم ناومان هێنان*.

لە بارەی بەیتەکانی ئەم دەستەیە، دوو تێبینی بە پێویست دەزانم:

ئەلف ـ جیاوازی بەیتەکانی ئەم دەستەیە، لەگەڵ بەیتەکانی جۆری یەکەم زۆرکەمە. وا هەیە نوسخەیەك لە بەیتێکی دیاریکراو، بخرێتەخانەی بەیتەکانی جۆرییەکەم بەڵام نوسخەیەکیتری هەمان بەیت سەر بە دەستەی دووهەم بێ.

ب ـ بەیتێکی وەکوو وەنەوش و بەرەزا، زۆربەی تایبەتمەندییەکانی ئەم دەستە بەیتەی هەیە. بەڵام لە بەر ئەوەی بەندەکانی بە شێعری مەنزووم

* بڕوانە لاپەڕەی ٨٧

هەڵچنراون و شێعری وتاری تێیدا وەلانراوە، لەم دەستەیەدا جێگای بۆ ناکرێتەوە.

نموونە: بەیتی دمدم، غەزای سیسەبان، قۆچ عوسمان، خەج و سیامەند، قەرو گوڵەزەر[٢].

٣ ـبەیتی خوازەیی:

ئەو بەیتانەن کە لە فەسڵی پێشوو لە بەشی لادان لە مەنتیقی مەجازیدا، وەکوو دەستەی دووهەم، ناومان هێنان[*]. خاوەنی ئەو تایبەتمەندییانەن:

١.٣ بەیت ئاماژە بە داستانێك دەکا، بەڵام یەکەکانی گێڕانەوە، لە ناو دەقدا ئامادە نین. داستانی بەیت، لە دەرەوەی دەقیَ بەیت واتە لە مێژوو یان لە یادەوەری گشتی خەڵکدا بڵاوە و وەکوو بەیتەکانی دوو دەستەی پێشوو، رووداوەکان بە وردی لە ناو دەقی بەیتدا ئامادە نین و هەر بۆیە دەقەکانی ئەم دەستەیە لە چاو دەقەکانی دەستەکانی پێشوو کورتترن.

٣ـ٢ مەنتیقی خوازەیی بە سەردا زاڵە.

٣ ـ٣. لە زنجیرەی هاونشینی (نزا + گێڕانەوە + رۆرۆ)دا، ئاڵقەی سێهەم واتە رۆرۆ، چوار چێوەی بەیت پێك دێنێ و ئاڵقەی گێڕانەوە کاڵ دەبێتەوە.

٣ـ ٤ بەشی بەندی لە شیعری وتاری پێك هاتووە.

نموونە: سەیدەوان، کانەبی، ئەحمەدی شەنگ، کاکە میر و کاکە شێخ، لەشکری، سوارۆ، زەینەلێ و گۆزەلێ:

ئەی براله زەینەلێ گیان

ئەمن لەوڕۆ زەینمدەمدا دوژمنی زەینەڵی برام

ئەگەر روویان دەکردەوە سەراپەردەی کاکە زەینەڵێ

هەڵیان دەگرت سەرکێش و کراسان

---

[*] بڕوانە لاپەڕەی ٨٧

بەبێ ساحێبی دەیاندا لە کۆلی حەمبالی
ئەی براله /تۆخوداکەی/ زەینەلی دە زوراری
ئەتۆ ئێلچی شای پیر خدرێ هەر بە خوونکاری
کوڕە براله ئەو رۆ بەهارە
بەهارێکم گەیوە وەگوزەلێ
چۆمەکەی شەمامکێم بە قۆرێ گیرێ
ئەورۆکانێ لە من دەدانەوە چەلانێ [٣]

## ٤ـ بەیتی مەنزوومەیی جۆری یەکەم

شێعر لەم بەیتانەدا، بە شێوەی مەنزووم دەهۆنرێتەوە.زۆربەی دێڕەکان لە یەك بەندا،خاوەنی یەك کێشن و کێشەکەش زیاتر کورتە. بەڵام بەگشتی وەکوو شێوەکانیتری ئەدەبی فۆلکلۆری، لە باری فۆرمییەوە نەختێك ئازادی تێدا بەدیدەکرێ. واتە هەموو جارێ ژمارەی(تعداد) دێڕی بەندەکان، وەکوو یەك نین و سەروایەك بەلانیکەمەوە لە سێ دێڕدا دووپات دەبێتەوە و جاری وایە تەنانەت بەشی تەختیشی هەیە. هێندەك جار دێڕەکان لە جیاتی یەك کێشی برگەیی، لە دوو یان سێ کێشی دیاریکراو کەڵك وەردەگرن. زۆربەی ئەم بەیتانە درێژن و بە وردی رووداوەکان دەگێڕنەوە.

نموونە:زەمبیلفرۆش،محەممەدیحەنیفە،شێخیسەنعان،بەیتیفەقیری، بارام وگوڵەندام، باپیرئاغای مەنگوڕ، هەمزاغای مەنگوڕ:

لە کووچە و لە دالانان
هەمزاغا دەنەرێنێ
دە تفەنگم لە بۆ بێنن
دەزرێ و دەمەر قۆپانێ
دە ئەسپم لە بۆ بێنن
مەتالێ و حەیزەرانێ

بە گەل و وەدەرکەوتن
کا دەروێشی کوێستانێ
دەچوون بۆ باغی قیبلەی
لەوێ دەدران لە سانێ
هەمزاغا ئاوری داوە
حەمەد و سڵەمان کوانێ
حەیفێ لە بۆ حەمەدێ
کوژراوە مەردی مەیدانێ
سێتەڵاقەی فرێ دەدان
بە سێ جزمەی قورعانێ
لێرمشی لێ ناگەرێم
دەیماڵم تا تارانێ[٤]

**٥ ـ بەیتی مەنزوومەیی جۆری دووەم**

پێکهاتەی ئەم جۆرە مەنزوومانە یەگجار زۆر لە شێعری کلاسیکی برگەیی نزیک دەبێتەوە و ئەو ئازادییە فۆرمییەی لە بەیتی مەنزوومەیی جۆری یەکەمدا دەدیترێ لێرەدا وەبەرچاو ناکەوێ. ئەگەر لە سەرەتاکانی مەنزوومەدا، وا هەبێ زیاتر لە چەند دێڕ پێکەوە، هاوسەروا بن، بەرەبەرە، دێرەکان دوو بە دوو هاوسەروا دەبن و ئیتر ناتوانین ناوی دێریان لە سەر دابنێین و دەبێ وەك نیوە بەیت ( بەیت بەمانا شێعرییەکەی) واتە وەك میسراع چاویان لێ بکەین. کێشی برگەیی، بە درێژایی دەق ناگۆرێ و بەیت بەشی تەخت ناگرێتەوە.

ئەم جۆرە مەنزوومانە، زۆرترین جیاوازییان لەگەڵ پێکهاتەی تەواو عەیاری بەیت هەیە. بە بروای من زۆر بە زەحمەت دەتوانین ناوی بەیتیان لە سەر دابنێین.تاقە جیاوازییان لەگەڵ ئەدەبی کلاسیك و هاوبەشییان لەگەڵ ئەدەبی فۆلکلۆری ئەوەیە کە ئەو تەعبیر و مەبەست و مانایانەی تێیاندا هەیە، کەمتر

رەنگ و بۆنی فەرهەنگی رەسمییان پێوە دیارە و زۆرتر سەر بە فەرهەنگی خەڵکی رەشۆکین.ئەم بەشە لە ئەدەبی فولکلۆری، لە باری زاراوەشەوە پەیرەوی لە زاراوەی باوی ناو بەیتەکان واتە زاراوەی ناوین ناکا. دەقەکانی درێژن و یەکەکانی گێڕانەوە، بێنێوبڕ تێیاندا هاتووە.

نموونە: عەزیر و کوبڕا، وەنەوەش و بەرەزا:

باوک وتی:

رۆڵە نە تانج و تۆمار، نەزەوق دنیایی

نە ئەساس نەئەسپ، دەبدەبەی شایی

نە نان نەتۆشە، نەخەرجی رات هەس

نەسوار نە لەشکر نە تۆ سەفات هەس

نە پووڵ نەپارە نە دوعای خەرجی

ئەشێ تۆ بڕۆیت وەناعیلاجی ...

بەرەزا هەڵسا گەیای بێ نەشە

دارێکی هەڵگرت بێ نان بێ تۆشە....

مەملەکەت گەڕیا ئیمجار دڵ مەویس

چووە مەحاڵ لەغوان، دەور و بەرئینگلیس

گەڕیا بۆ یاران زووخاو دڵ لە بەین

دەورەی کەلبەلا، دەورەی کازمەین[٥]

٦ـ بەیتی شێوە حەیران

کە دەڵێین بەیتی شێوەحەیران، بێجگەلەحەیران، مەبەستمان لەو دەقانەیە کە حەیران نین بەڵام لە باری پێکهاتەوە دەچنە خانەیەکی ئەوتۆ کە لە ناوەندیدا فۆرمی حەیران جێگیربووە.بەو تایبەتمەندییانەی خوارەوە دەناسرێنەوە:

١ـ٦ لە نێوان رەگەزەکانی شێعر و چیرۆك و دراما، یەکەمینیان بە دەسەڵاتێکی زۆرەوە لە ناو دەقدا زاڵە.

٦ـ٢ لە سێ ئاڵقەی نزا، گێڕانەوە و ڕۆڕۆ، ئاڵقەی نزا، بە شێوەی پێهەڵگوتن و خۆزگەخواستن و عەرزی حاڵ، لەناو دەقدا ڕەنگدانەوەیەکی تۆخی هەیە و دەتوانین بڵێین نزا، چوارچێوەی بەیت پێکدێنێ.

٦ـ٣ خاوەنی مەنتیقێکی دووکەسییە. واتە کەسێك خۆشەویستەکەی دەکاتە بەردەنگ و زیاتر بە گۆشە نیگای دووهەم کەسی تاك دەیدوێنێ، و جاری وایە خۆشەویستەکەشی لە بەرامبەردا هەر ئەو جۆرە دوواندنە ڕەچاو دەکا. هێندەك جاریش ئەو مەنتیقە دوو کەسییە، بە شێوەی ئامادەبوونی یەکێکیان و مودیلسازی حوزووری دووەمینیان لە لایەن کەسی یەکەمەوە وەبەرچاو دەکەوێ.

نموونە: حەیران، گەلۆ، پایزە، ئازیزە:

وەرە عازیزێ

ئەمن کراسێکی لە بۆ عازیزە جوانەکەی خۆ چێ دەکەم

بەری لە هەلآلێ، پشتی لە سوێسنێ، نێوئاخنی ئاوریشمی خاو بێ

گوڕۆڵەکانی لە پەلکی دەسوورە گوڵێ

وەستایانی لە بۆ دێنم لەکۆیە، لە حەڵەبێ، لەدیار بەکرێ

لە کارخانەی دە قۆچە مووسڵێ

هەر وەستایەکی تەقەڵێکی تێهەڵبدا

حەیرانێکە زورار و لێ لێ یەکە باریك و

دەبڵا عازیزێکە سەر بە مۆرێکی لە سەر بلێ

ئارێ عەزیزێ وەرە بە من عازیزێ

ئەو پێکهاتایە بەم تایبەتمەندییە دەسنیشان کراوانە، لە ناو دەقەکانی هەر دوو زاراوەی سەرەکی کوردیدا دەدۆزرێتەوە و لەراستیدا جیاوازی زاراوە نابێتە هۆی جیاوازی فۆرم. قالبی بەیتی شێوەحەیران لەم دەقەی خوارەوەشدا کە بە دیالێکتـــــــی کرمانجی سەرەوە، وەبەرچاو دەکەوێ:

ئەورۆ کورك دگۆ:

کەچکێ ماڵ خراپێ وەزێ دوونێ هێوارێ واتمە داخوازیێ
بەژنی زراڤـ، هەر دوو چاوێ رەش بەلەک، دێما سۆر ب گولێ
تەرەسێ بابێ تەرا دگۆ
وەزێ مەیرەمێ خورا نادەم هێشتا بچویکو دتەفالا
ئەوڕۆ کەچک دگۆ: لاوۆ منێ سوندەک خواردییا
ب دەرگاێ شێخ هادی، ب قوبێ مەحمەرەشان، مەلەکێ تاووس،مێرکا شەوێ
لاوۆ وەزێ حەفت سالا چ مێرانەکەم[٧]

### ٧ ـ لاوك

لاوك بەشێك لە ئەدەبـــی فۆلکلۆری کـــوردییە کە دەقەکەی بەم خەسڵەتانەوە دەناسرێتەوە:

١ـ٧ تایبەتمەندی دراماتیکی دەق، بەچڕ بوونەوەی گێڕانەوە و داکۆکی کردن لە سەر چەمکی «کێشە»، زۆر تۆخ دەبێتەوە.

٢ـ٧ نزا و رۆرۆ، لە چەند وشەدا، یان لە دێرێکی کورتدا دەردەبڕدرێن و یا بە تەواوی وەلادەنرێن.

٣ـ٧ لە باری کورت بوونەوە، دەقی لاوك زۆر و کەم وەکوو دەقی بەیتی خوازەییە. بەڵام جیاوازی ئەو دووانە لەوەدایە کە لەبەیتی خوازەییدا، لە جیاتی چڕبوونەوەی گێڕانەوە، رۆرۆ بەشێکی زۆری رووبەڕی دەق دادەگرێ. لاوکیش گەرچی لە باری گێڕانەوەوە، ناتەواوی تێدا هەیە، بەڵام لە چاو بەیتی خوازەیی، وردتر باسی رووداوەکان دەکا.

٧ ـ ٤ بەزاراوەی کرمانجی سەرووە. بەڵام ئەم خاڵە بەم مانایە نیە کە هەردەقێکی فۆلکلۆری بەم زاراوەیە بێ، لاوکە.

نموونە: شەڕێ کوت و عەمارە ـ شەڕێ چیاێی بێبۆزێ. حەسەنێ ئۆسمان:

شەرەکێ دادکەتە باخەپسێ بابی لەیوب دسەردا ئاخەبانە

ل گە کەوارینێ سوبێدێ مێزا بکات دەنگێ بێ دووکەلێ
میران ئەوە مەشیانە، بەر حەرشێ خودێ ب عاسمانە
حەسەنێ ئۆسمان بەرامبەری ئۆردینێ عەسکەرێ دادسەکنی
بانگی کردێ بشارێ چەتۆ محەمەد عەلیی سەردلێ
ئەری گەلی جلەوییان جاری زۆر دێی
عەسکەرێ کەکێ خۆرا دەرکەوونە وەرنە مەیدانێ
ئەزێ بەرێ بێ دووکەلی میران بدەمێ وەندە بخینم
بزانن ل من و هنگۆرا کی بەرخن و کی بەرانە[٨]

هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێ کرد، ئەم حەوت دەستەیە، جگە لە تەواوی وێکچوونەکانیان، لە تایبەتمەندییە هەراوەکاندا لێك جیا دەبنەوە. لە ئاستێکی خوارتردا، دەقی بەیت زۆر رێسای جوانکارانە لە خۆ دەگرێ گە زۆربەی ئەو رێسایانە، لە هەموو ئەو حەوت شێوە پێکهاتەیەدا، وەبەر چاو دەکەون و هێندەکیشیان تایبەتی یەك یان چەند پێکهاتە لەم حەوت دەستە باسکراوەن. لێرەدا، لیستەی ئەم وردە رێسایانە، بە نموونەکانیانەوە دەخەینە روو:

### ١ـ درێژەی گوتە بە ریز کردنی دەستەواژان.

چەند دەستەواژە بۆ دەربڕینی مەبەستێك، بە دوای یەکتردا ریز دەبن.

جاری وایە ئەو پاژە جیاوازانە، هەموویان ئاماژە بەکەسێك یان شتێك دەکەن و جاری واشە ئاماژەیان بڵاوە.

ـ هەڵمدەستاندەوە شینکێ، مات و مەلوولێ، گوێ مقەستێ، دامێن بە خوسارێ[٩]
ـ لە شانی کردووە چارشێو شانیکی موشەججەری قیمەت گرانی عەسڵەکارخانەی فەرەنگییە[١٠]
ـ خۆمن سوێندێکە خواردوومە، دەستی خۆم هەڵناگرمەوە
لەوێ شەنگەژنان، گەردن کێلان، قەد باریکان، شل و ملان[١١]

لەم دوو نموونەیەدا، هەموو وەسفە جیاوازەکان، ئاماژەیان بۆ یەك بابەتە. بۆ وێنە شەنگەژن و گەردن کێل و قەد باریك و شل و مل، گشتی وەسفی نازدارن. لەم نموونانەی خوارەوەدا، پاژە جیاوازەکان، ئاماژەیان بۆ چەند بابەتی جیاوازە:

- ئەدی ناروانیە توقان، تەڵەسمان، زێڕان، زنجەقان، گوواران،
کرمەکان، ئاومدنگیان، خەبەرچییان،لەگەڵ بەندی دەپیرە گوواریٚ؟[١٢]

- ئەمن کەپرێکت بۆ دروست دەکەم
لە سویسنێ، لە هەلاڵێ، لە بەیبوونێ، لە سوورە گوڵێ[١٣]

- ئەمن بریندارم بە تیران، بەشیران، سەت برینم کەوتوّتە بەدەنێ
دەڵێ بۆم گازکەن، حەکیمان، عەتاران، لوقمانان، چازانان[١٤]

٢ ـ درێژەی گوتە بە زیادە خستنە سەر.

وەکووخاڵیپێشوو،بەلاّمبەهێنانیوشەیەکی وەك«دەگەڵ» یان «دوامـــەتی» وەسف درێژ دەکرێتەوە.

- با بەسەرمان دابێ بۆنی هەلاّلە و بەیبوون و گیاخاو لەگەڵ شلکە بیرایە[١٥]

- گەلی دەدۆستان و دەبرادەران لە بۆکاکی خۆت دێنن رایە دوامەتی دەگەڵ ئەوێ تەگبیرێ

- بلاّ لە بۆم هەڵقەنن چاڵێ، دامەتی دەگەڵ ئەوێ بیرێ[١٦]
- لەمن مەگرە مانێ دەگەڵ ئەوێ گەورەمانێ[١٧]

٣ ـ درێژەی گوتە بەرەتکردنەوەی گوتەیەکی پێشوو.

لێرەدا، لە جیاتی زیاد کردن و دووپات کردنەوە، رەتکردنەوە دەبێتە بیانووی درێژکردنەوەی گوتە. ئەم رێسایە بەهێنانی وشەیەکی وەك «نا» یان «ناوەللاّ»جێبەجێ دەبێ:

- ئەورۆ ئەستێرێک هەڵدێ لە تاقی دەعاسمانێ
شۆق و شەبەقی خۆی لە من دەداوە لە برجی دەموقبەرێ

ناوملّا لە بریقەی تۆق و تەڵەسمان، شۆرابی دەگەردنێ، پەری دەخەزێمێ[١٨]

ـ هەتیو حەیرانم دە کەمین کەوتووە، لە قەڵاتی دراوێ

نە بە خودای لە پشت ماڵی دەسپیداری[١٩]

## ٤ـ درێژەی گوتە بە دووپات کردنەوەی دەستەواژان.

زۆر بە سارکاری چەند دەستەواژە یان رستە دووپات دەبنەوە:

ـ ئەمن دەڵێم لە بازی داوێ، لە بازی داوێ، لە رووحی دایکێ منت کەوێ

ئەمن دەڵێم لە ولاتی گێلان و رەشتێ، لە ولاتی گێلان و رەشتێ

ئەو بەستۆک لە بەر تەلانی، بەستوک لە بەر تەلانی[٢٠]

ـ لەو عەینە دابوو ئەگەر دەرکەی لە سەر خۆی دادەخست، گاڵەکاڵە.

ناڵەناڵە قاومقاوە[٢١]

هەک مامزێ دایکی دووکاری، هەک نەمێنم مامزی دایکی دووکاران[٢٢]

## ٥ـ درێژەی گوتە بە هێنانی بۆچوونە جیاوازەکان.

لێرەدا، خۆشخوان بە رواڵەت جیاوازی دەخاتە نێو بۆچوونی چەندکەس سەبارەت بە مەبەستێکی تایبەتی و هەموو ئەو بۆ چوونانە لە درێژەی وسفەکەیدا دەگێڕێتەوە:

هێندێک دەیانگوت: رۆژێ عەرشە و هێندێک دەیانگوت خێر ئاخری زەمانە

هێندێک دەیانگوت لە عەرزییە و هێندێک دەیانگوت خێر لە گەواڵێ گەواڵی دەعاسانە

هێندێک دەیانگوت دەنگی قاز و قوڵینگانە لە گەواڵی عاسمانێ

هێندێک دەیانگوت خێر ئەوە دەنگی شەپۆلی بەحرانە

هێندێک دەیانگوت خێر قافڵەیە کاروانە، هێندێک دەیانگۆت نەخێر پاییزە و وەختی لەیلە و مەجرووم خۆڵێکدانە

ئەوە گوارە وکرمەک و وردەگژنیژ، ئەوانن دەنگییان دەچێ بۆ حەوقی عاسمانە

هێندێکیش پێیان وایە کارەکارە، شەرە بەرانە
شۆڕ مەحموود میوان بوو هەتا سێ ڕۆژانە
هەقی‌خوی وەرگرت لی عەزیەت و عازابوسەخلەتی و ساغاوی تورکە تۆرکومانە[٣٣]

## ٦ ـ گازی کردنی بەرودوا

چەند کەسایەتی، یەکبەدوای‌یەك بانگی یەکتر دەکەن هەتا لە کۆتاییدا، مەبەستێك بدرکێنن:

ـ گولیـزار ب سێ دەنگان گازی کردە موحتـــــەبەرێ
موحتەبەر گازی کردە میرایێ، جــــەمیلاێی بانگ دکر
روحەیزاێی، روحەیزاینێ بانگ دکـر مرارێ کورێ نەمایێ
پشتی سمایل ئاغا بابی خەسرەو، بەگ لیکی کـــوردان
دوازدە ئاغا عەشیرێ گران، نەمینم ل دارێ دونیــــــایێ
بلانێ ئاگرێ کولا حەلەبێ بکەوێ مالا پەهلەوی شاهێ عەجەمۆکا[٣٤]

ـ ئەوە شەرێکە لە نێوان گوڵانی جوانی دەهەواری باسەطایە
شللێر دەڵێ بە هەڵاڵێ
هەڵاڵ دەڵێ بە بەیبوونێ
بەیبوون دەڵێ بە گیاخاوێ
گیاخاو دەڵێ بەشەش پەڕێ
گوڵینە با ئەمە شەرعی خۆمان بکەین
بزانین لە نێومەدا کێ لەهەمان جوانترە
لە سەر ئەوێ کاولە دونیایە
ئەوە جەمعی گوڵان پۆل بەست دەبوون
هەڵاڵە دەڵێ بە گیاخاوێ
گیاخاو دەڵێ بە شلێرێ
شللێر دەڵێ بە شەش پەڕێ
شەش پەڕ دەڵێ بە بەیبوونێ

دوایە بە عام دەیاننارده کن پۆپەلی شەنگە بیزایە[٢٥]

**٧ ـ تێهەڵکێشی ناوی ناسراو.**

بە دوو شێوە ئەم ڕێسایە کەڵکی لێوەردەگیرێ. شێوەی یەکەم، هێنانی ناوی کەسێکی بەنێوبانگە و شێوەی دووهەم، هێنانی ناوی شوێنێکی ناسراوە.

**ئەلف: هێنانی ناوی کەسێکی ناودار:**

ـ وەبزانم سامی نەریمانە و تازەی سەر لەبن گلێ دەرهێناوە

یانە حەزرەتی عومبەرە ئەگەر لە شەڕی یەزدەگوردی گەڕاوە

یان خاڵندی بنی وەلیە ئەگەر سی و دوولفکەی بە سەر عەرزیدا بەردەداوە

یان حەزرەتی عەلیە ئەگەر لە خەیبەرێ دەروازەی، لە ریشە دەرهێناوە

کردی بە پرد و تەواوی ئەسحابە پێدا دەپەڕاوە.

یان ئەحمەدی شەنگە ئەگەر سوار دەبوو لەوڵاغی لەیلك، لەو وایە لەو زیاتر

کەس لەم دنیایەدا نیە[٢٦]

ـ نازادار حەیرانی خۆ بە کێ دەشوبێنم

بە خەجێ شەلی ئارەحمانی بە مێری مەدیان

بە خانزادی سۆران، خوشکی سولەیمانخانی[٢٧]

**ب: هێنانی ناوی شوێنێکی ناسراو:**

خۆزی لە خۆزی دەئیمانێ، ئەمن خەرج ئەستێنی ماچان بام

لە گومبەزی سوڵتان عەبدوڵڵا عارەبی کلکەی حوسێنی غازی

لە دەرکی قەڵاتی کاولە هەولێرێ

لە مزگەوتی مەلاجامی

جەمامی پووتی

شەقڵاوێ ڕەنگین

سەرکانی کلو لە سەقلاوێ[٢٨]

**٨ ـ زیاد کردنی پاشگری (موە) بەدوای کرداردا.**

لەو کاتانەی زیادکردنی (ەوە) بە کردار، لەباری مانایی‌یەوە، پێویست نیە و هیچ جۆرە دووپات بوونەوەیەك لە گۆڕێدانیە، ئەم پێوەزیادکردنە، دەبێتە ڕێسایەکی دووپات کراوەی ناو دەقی بەیت و باو:

کیژ دەڵێ‌ك هەتیوە لاوە تۆ دەست دەوە تفەنگی خۆت بە عەزمێ ڕاوێ
ئەمن دەست دەدەمەوە گۆ زەڵێکی خاسەرەنگ بە بیانووی سەرواێ
ژوانێ داوێنەوە سەری مەیدان بەڵەکی، ئەگەر حاشارگەن هەڵگرت چاکە
دەنا دەچینەوە خوار بۆ سەرکانی و گۆلەکەی پیرە زەرواوێ[٢٩]

٩ ـ هێنانی کردار بە شێوەی ڕابردووی بەردەوام.

واتە لە جیاتی ڕابردووی سادە، کەڵك لە ڕابردووی بەردەوام وەردەگیرێ:

ـ ئازیز ئەمن پیر نەبووم، پیرت دەکردم
وەرمەدەردار نەبووم، دەردەدارت دەکردم
ڕەنگ زەرد و لێو بەبار نەبووم، ڕەنگ زەرد و لێو بەبارت دەکردم[٣٠]
ـ جومحێك وابوو لە جوومعانە
هەڵیدەگرتەوە چەند کەیخودای دەقانوون زانە
دەچۆوە ماڵی بابی خەجێ، دەبۆوە میوانە[٣١]

١٠ ـ هێنانی ناوێك بە شێوەی تاك و کۆ.

وەکوو جوانکارییەك، دوای ناوێکی تاك، هەمان ناو بەشێوەی کۆ دێتەوە. هەڵبەت لە ئاخافتنی کۆنی کوردیدا، هێنانی ناوی دووهەم بە شێوەی کۆ، باو بووە وەك ئەوەی لەجیاتی ناسر و ماڵ‌ماڵ، گوتوویانە ناسر و ماڵ ماڵان:

ئەوە کەواڵێکی لە منی هەڵدەدا، دەگرێ بەری عاسمانی ڕەشی تاری
تەردەکا مەغلەت و مەغلەتان، قەربۆت و قەرەبۆتان[٣٢]

١١ـ هێنانی «ناسە» لە جێگایەکی نائاسایی ڕستەدا.

کردارێکی وەکوو «ڕۆیشتم»، لە دووبەش پێکهاتووە: (ڕۆیشت + م). بەشی هەوەڵ بنەی ڕابردووە و بەشی دووەم، ناسەیە. ناسە زۆرجار نالکێتە کردارەوە بەڵکوو بە دوای بەشێکی‌تری ڕستەدا دێ. هەڵبەت لەم حاڵەتەشدا، ناسە

ناتوانێ بلکێتە هەموو بەشێکی رستەوە. لە دەقی بەیتدا، وا هەیە ناسە لەجێگایەکی نائاسایی رستەدا بەکار بهێنرێ:

ئەمن دوێنێم ناسک و نازدارێ دەمالێن بەجوانی دەدی [٣٣]

ئەمنت دەمرمەوە لەبەر بەژنێکە باریک، بۆری بەڵەکی سەر باڵ شینە [٣٤]

چبکەم کوێرم بوون هەرتک چاوە [٣٥]

## ١٢ ـ هێنانی (کە) وەکوو ئامرازی ئیزافە

لە زمانی کوردیدا، ئامرازی ئیزافە، (ی) ـە وەکوو زەندیبەبازن بەڵام لە دەقی بەیتدا، ئامرازی (کە)، جێگای (ی) دەگرێتەوە:

لە دڵێکە من گەرێ چەندی لە ژانە دەڵێی بەحری شلۆوییە

.... ئەتۆ زەینێکە خۆت بدەوە کراسێکی مەخمەڵ دارایی ئەگەر لەسەر گراوی

پانیەمە وەکوو فەرەنگی [٣٦]

لە پاشم بە جێ نەمێنێ بەژنێکە باریک و دووچاوی بەنگییە و سینگێکە سپییە [٣٧]

ئەمن سەرێکە خۆم هەڵدێنا تەماشای بەژنی باریکم دەکرد [٣٨]

## ١٣ ـ رێکخستنی دەستەواژە بە ئامرازی(دە)

ئامرازی(دە) لە کرمانجی ناوەراستدا، گۆرداراوی ئامرازی کۆی کرمانجی سەروو واتە (ێت) ـ ە

دۆستێت من ←——— دۆستی دەمن

ئەو ئامرازە لەکرمانجی ناوەراستدا، بەرەبەرە، لە مانای خــــۆی وەکوو ئامرازی کۆ، بە تاڵ بووە و بۆتە ئامرازی ئیزافە، واتە لەنێوان (مضاف) و(مضاف الیە) داهاتووە. ئەو شێوە گوتنە کە لەئەدەبی فۆلکلۆریدا باوە، لە بن زاراوەی شنۆیی و هەروەها لەنێو مەنگوراندا، کەڵکی لێ وەردەگیرێ.

ـ لە خودا وەندی میری مەزن دەکەم تەڵەبێ گولەکی دە گولە مێردانت بمرێ

هەتا وەکوونێ لبخۆم دەگەڵ بەژنێ باریک دەگرمەوە دەستەی دە
دەستباری[٣٩]

### ١٤ ـ ڕێکخستنی دەستەواژە بە ئامرازی (لە).

واتە لە جیاتی ئەوەی «لە» وەکوو وردەواژەیەك لە نێوان دوو بەشی جیاوازی ڕستەدا کەڵکی لێ وەرگیرێ، وەکوو ئامرازێك بۆ ساز کردنی پاژێکی تازە دەکار کراوە:

ـ ئەمێ دوعایەکێ بکەین یا وەللاّ یا غەوسێ ماڵ لە بەغدایێ[٤٠]
ـ شێ محەمەدۆکەی ماڵ لە باغەڵیان، دوورم دەستی منت ناکاتێ
شێ محەممەدی ماڵ لە حەساری دەستی منت بە دامێن بێ[٤١]
ـ ئەمن چ بکەم لە بۆ برایەکی لە دای و بابی[٤٢]

### ١٥ ـ هێنانی ئاوەڵناوی ئاماژە بە شێوەی (ئەوان ـ ئەوێ).

ئەو دووئاوەڵناوی ئاماژەیە، زیاتر لە کرمانجی باکووردا باوە (ئەوێ ڕۆژێ ـ ئەوان ڕۆژان) لە کرمانجی ناوەڕاستدا، بۆ هەر دووك ناوی تاك و کۆ، زیاتر (ئەو) دەکار دەکرێ: (ئەو ڕۆژە ـ ئەو ڕۆژانە):

ـ مردن گەلێک دەردێکی گەورە و گرانە، ئەگەر هات لە پیر جوانان
نابوێرێ
پاش ئەوان ڕامووسانان، لە من نیزیکە هەر بەخێرێ.[٤٣]
لە دڵێکە من گەرێ چەندی لە هێشە، چەندی لە ژانە، ڕانلوەستێ لە بەر
ئەوێ ناسەورێ[٤٤]

### ١٦ ـ بە خۆ نیسبەت دان.

دەنگ بێژی ئەویندار، بەپێی ڕوانگەیەکی ڕۆمانتیکی، خۆی بە ناوەندی جیهانی دەوروپشتی زانیوە و هەموو بارودۆخی سروشتی لە دەلاقەی هەستی بە هێزی خۆیەوە دیوە و بە خۆی نیسبەت داون:

ـ بەڵێ وەی لێ برا، لەمن چ سوبەیە، لەمن سوبەیەکا زوییە[٤٥]
ـ کورینە کۆ وتەرازو هەڵدێن، ئەستێرە لەمن دەسێنە[٤٦]

ـ کورێنە دێیەری بەرماڵان لەمن بەرێزە گوێزە[٤٧]

ئەو رۆکە هەولێر لەمن بەمیلە[٤٨]

### ١٧ـ رووکردن لە بەردەنگێکی تایبەت.

پێکهاتەی بەیت بە تایبەت بەیتی شێوە حەیران، بەچەشنێکە کە خوشخوان، هەمووان دەمان پێویستی بە بەردەنگێك هەیە. جا ئەگەر ئەو بەردەنگە، خۆشەویستەکەی نەبێ، جەماعەتی دۆست و برادەرانێتی.

ـ دەجا دەڵێم کاکینە پێی بڵێن بە سەری سەفینێ

دەگەڵە من گەلێک یاربێ[٤٩]

ـ کاکی خۆم ئەو رۆکانە ئەستێرێک لەمن هەڵدێ لە ناوەندی عاسمانێ[٥٠]

ئەرێ کاکینە، براینە، برادەرینە، حەیران ئەتۆ وەرە لە تەرگەوەرێ کاکی خۆم ناوەڵڵا لە مەرگەرەرێ[٥١]

### ١٨ ـ مەجازی پاژ بەگشت.

لە جیاتی ئەوەی ناوی کەسێك بێ، ئەوکەسە بە تایبەتمەندیەکی بەرچاوی خۆی، ئاماژەی پێ دەکرێ.

کورینە برینی هەموو دۆست و برادەران دێننەوە سارێژێ

لی من و بەژنی باریك و زەندێ بەبازن بە سوت و سوێنە[٥٢]

ـ ئەوجا کەچک دگۆ: مرازێ مراز دارێ خەلك و عالەمێ

هەموو دونیایێ پێکەرا حاسلێ دەبوو، دێلا مرازێ وەزو

بەژنا زراف و چاڤا بەلەك و دێما سۆر ب گولێ

ئالوبەتی بیا گولان و دەردان و خەمان و کەسەران نەبوو حاسلێ[٥٣]

### ١٩ ـ هێنانی هاوکاتی پرسیار و وڵام.

پرسیار و وڵام جاری وایە لە دێڕێکدا و هێندەك جاریش لە چەند دێڕدا، بە دوای یەکدا دێن:

ـ ئەوە کێ بوو لە بەنگینی گوڵباوە

ئالفتاوەو لەگەنی بۆ ئاغای خۆی هێناوە.[٥٤]

ـ کیژێ لە کوێ ئامان لە دارە ئیشکی[٥٥]

- کاکی خۆم لە کوێ، ئامان لە سپی چارێ[٥٦]

## ٢٠ - ئاشکرا کردنی شوبهاندن

دەنگ بێژ، راستەوخۆ باسی شوبهاندنی نازداری خۆی بە شتێکی جوان و ناسك دەکا

- ئەوە کوڵمەی ئەوێ ناسك بەدەنێ دەشوبێنم بە پەلکی هەڵاڵە بەبیوونێ

## ٢١ - پێك هێنانی جومگەی مەنزوومەیی:

لە مەنزوومەدا، چۆنیەتی لێك بەستنەوەی بەندەکان، هێندەك جاران بەم جۆرەیە کە دەستەواژەی کۆتایی بەندێك، لە سەرەتای بەندی دوایە دا دووپات دەبێتەوە:

- خولاکەی وەستاینە کراسی چا بێ
هەر درووەمانی لالیك تێدابێ
نازدارم زیزە و پێی قایل نابێ
ئەگەر ئەو زیز بوو کاسبیم نابێ

کاسبیم نابێ دەبم سەرگەردان
خەریك و خەمناك کەوتمە خێلان
وێڵداش و خزم لێم دەکەن فێلان

دەکەبۆی خۆی کرد لەبۆ جوانی
هێند هەڵپەری لە رووی زەمانی
لە کەبۆی کەوتبوو بە خۆی نەزانی

بە خۆی نەزانی ببوو جانفیدا
ئاخر لەو کراسەی واکردبوو حاشا
ئەلحەمدولیللا خەزێمیش نەما[٥٧]

پەراوێزەکان:

١ـ لە مانە، بەیتەکانی لاس و خەزاڵ، مەم و زین، برایموک، شێخ فەرخ و خاتوون ئەستی ناسرومالّمال، مەحمەلّ و برایمی دەشتیان و جولّندی لە نوسخەی ئۆسکارمان هەلّبژێردراوان و بەیتەکانی سەعید و میرسێوەدین بەگ و شۆڕمەحموود و مەرزینگانیش لە نوسخەی قادری فەتاحی قازی وەرگیراون و گەنج خەلیلیش لە نوسخەی یاسین حەسەن گۆران وەرگیراوە. ئەم تێبینیە بۆیە پێویست بوو چونکە هێندەك لە بەیتەکان، لەنوسخەیەکەوە بۆ نوسخەیەکی دی، گۆڕانیان بەسەردادێ.

٢ـ دمدم و قوّچ عوسمان، نوسخەی ئۆسکارمان، قەروگوڵەزەر، نوسخەی سەلاح پایانیانی، لە دەنگی خلەدەرزی. گۆڤاری سروە ژمارە ١٥٥ ـ لل ٣١ ـ ٢٨، غەزای سیسەبان، نوسخەی رەسوولّ وەیسی. لە دەنگی عەبدوللابابغبان ـ گۆڤاری سروە، ژمارەکانی ٨٠ و ٨١ و ٨٢ ـ خەج و سیامەند نوسخەکانی ئەحمەدی بەحری لەدەنگی: حەمەرەسوولّی سۆڤی مینە، حەمەدی بەیتان، حوسێنی شەشە (١) رەسوولّ نادری، عەولا جەیران و...

٣ـ گۆڤاری سروە ـ ژمارە ١٥ ـ ل ٣١

٤ـ سەید عەولاسەمەدی ـ بەیتی هەمزاغای مەنگوڕ ـ گۆڤاری سروە ـ ژمارە ٣٢ ل ٢٥

٥ ـ محەمەد رەحیمیان ـ وەنەوش وەبەرزا، لە دەنگی مەحموود باوەئاغە ـ گۆڤاری سروە ژمارەکانی ١٤٩ و ١٥٠ و ١٥١

٦ـ ئەحمەد بەحری ـ گەنجی سەریەمۆر ـ سلێمانی پەخشی سەردەم ـ چاپی یەکەم ـ ٢٠٠٠ ل ١١٦

٧ـ یاسین حەسەن گۆران ـ لاوك وسترانی کوردەواری ـ هەولێر ـ چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری ـ چاپی یەکەم. ١٩٩٨ ل ١٣١ .

٨ـ هەمان سەرچاوە ل ٩٩

٩ـ ئەحمەد بەحری ـ گەنجی سەریەمۆر ـ سلێمانی پەخشی سەردەم. چاپی یەکەم ـ ٢٠٠٠ ل ١٦٤

١٠ـ قادر فتاحی قاضی ـ شۆڕ مەحموود و مەرزینگان ـ تبریز انتشارات دانشکدە ادبیات و علوم انسانی . چاپ اول ١٣٤٨ ـ ص ٦٢

١١ ـ سەرچاوەی ژمارە ٩ ل ٦٣

١٢ ـ سەرچاوەی ژمارە ١ ل ٤٩

١٣ ـ سەرچاوەی ژمارە ٩ ـ ل ١٦٥

١٤ ـ هەمان سەرچاوە ل ١٧٩

١٥ـ سەرچاوەی ژمارە ١٠، ل ٥٩

١٦ـ سەرچاوەی ژمارە ٩ ل ١٥٧

١٧ـ ئۆسکارمان، تحفەمظفریە ـ پێشەکی و ساخکردنەوە و هێنانە سەر ڕێنووسی کوردی: هێمن ـ مەهاباد ـ چاپخانەی سەیدیان ـ ١٣٦٤ ـ ل ٢٣٦

١٨ـ سەرچاوەی ژمارە ٩ ل ١٥٣

١٩ـ هەمان سەرچاوە ل ١٧٢

٢٠ـ هەمان سەرچاوە ل ١٥٥

٢١ ـسەرچاوەی ژمارە ١٠ ل ٥٨

٢٢ـ سەرچاوەی ژمارە ٩ ـ ل ١٧٩

٢٣ ـ سەرچاوەی ژمارە ١٠ ل ٦٤

٢٤ ـ سەرچاوەی ژمارە ٧ ـ ل ٧١

٢٥ ـ سروە ـ ژمارە ل ٩٠

٢٦ـ سەرچاوەی ژمارە ١٠ ل ٥٥

٢٧ ـ سەرچاوەی ژمارە ٩ ل ١٥٧

٢٨ـ هەمان سەرچاوە لل ٤ ـ ١٥٣

٢٩ـ هەمان سەرچاوە ل ١٦٧

٣٠ـ ڕەمان میسباح قانژی ـ سروە ـ ژمارە ١١٦ ـ ١١٥ ـ ل ١٢

٣١ ـ سەرچاوەی ژمارە ٩ ل ٣٠٥

٣٢ـ هەمان سەرچاوە ل ١٦٤

٣٣ـ هەمان سەرچاوە ل ١٦٧

٣٤ـ سەرچاوەی ژمارە ١٠ ـ ل ٧١

٣٥ـ سەرچاوەی ژمارە ١٧ ل ٢٦٨

٣٦ ـ سەرچاوەی ژمارە ١٠ ـ ل ٤٣

٣٧ـ هەمان سەرچاوە ل ٥٢

٣٨ ـ سەرچاوەی ژمارە ٩ ـ ل ١٦٨

٣٩ ـ هەمان سەرچاوە ل ١٧٥

٤٠ـ سەرچاوەی ژمارە ٧ ل ٧٣

٤١ ـ سەرچاوەی ژمارە ٩ ل ١٧٥

٤٢ ـ هەمان سەرچاوە ل ١٨٠

٤٣ ـ هەمان سەرچاوە ل ١٧١

٤٤ ـ سەرچاوەی ژمارە ١٠ ل ٤٣

٤٥ — سەرچاوەی ژمارە ٧ ـ ل ٨١

٤٦ — سەرچاوەی ژمارە ٩ ل ١٦٨

٤٧ ـ هەمان سەرچاوە ـ ل ١٦٩

٤٨ ـ هەمان سەرچاوە ل ١٧٢

٤٩ ـ هەمان سەرچاوە ل ١٧٦

٥٠ ـ هەمان سەرچاوە ل ١٨٠

٥١ ـ هەمان سەرچاوە ل ١٨٧

٥٢ ـ هەمان سەرچاوە ل ١٦٨

٥٣ ـ سەرچاوەی ژمارە ٧ ـ ل ٧٩

٥٤ ـ سەرچاوەی ژمارە ١٧ ـ ل ٢٤٠

٥٥ — سەرچاوەی ژماژە ٩ ـ ل ١٧١

٥٦ ـ هەمان سەرچاوە ل ١٧٢

٥٧ ـ مەحموود شکاك نژاد ـ بەیتی خەزێم ـ گۆڤاری سروە ـ ژمارە ١٣٩ لل ٧ ـ ٢٤

دوایین فەسڵی ئەم کتێبە، بریتی‌یە لەکورتە تەحلیلی دەقێکی دیاریکراو. دیارە جگە لەم نوسخەیە، هەر دەقێکی‌تر دەسنیشان کرابا، دەمانتوانی هەر بەم مێتودە، شی بکەینەوە. خوێنەر دەتوانێ لەمەودوا بۆتاوتوێ کردنی دەقی بەیتێکی دڵخواز لەم شێوازە کەڵك وەربگرێ.

بە بڕوای خۆم ئەگەر خوێنەر، هەر ئەوەندەی توانای روونکردنەوەی ئەم خاڵەی هەبێ کە فلانە نوسخە تایبەتە، سەربەکامیەك لەو حەوت پێکهاتە باسکراوانەیە، توانیوێتی شارەزایی‌یەکی باش لە بەستێنی ناسینی بەیتدا وەدەست بێنێ. ئەم دەقەی دەمانهەوێ لێرەدا شی بکەینەوە، نوسخەیەکی بەیتی خەج و سیامەندە و لەکتێبی «گەنجی سەربەمۆر»، هەڵبژێردراوە. ژمارەی دێرەکانمان لە تەنیشتیان نووسیوە و ژمارەی بەندەکانیش لە سەرەتای هەر بەندێکدا هاتووە. لە لای ژمارەی بەندەکان، ژمارە (تعداد)ی دێرەکانی ئەو بەندە لە ناو کەوانەدا نووسراوە.

ئەوشێوە ژمارەبەندی‌کردنە، یەکەمین‌هەنگاو بۆ تەحلیلی پێکهاتەیی بەیتە.

١ (٩)

١. ئەوە دەڵێن بابی سیامەند و بابی خەجێ برابوون

٢. هەر لە بەر خاتری سیامەندی لێک جودا بوون

٣. رۆژێکی لەوان رۆژان چەند مەلای زۆرزان، چەند کەیخودای دەچازان

٤. دەینارد‌نەکن بابی خەجێ، نەیدەدانە

٥. هەڵدەستاوە رووی دەکردەوە تەویلە و ئێختەر خانێ

٦. دەیەناوە دەرێ ئەسپێکی سم تەبەقی کلک لە سەر چووانە

٧. بەبەر دەرکی ماڵە خەجێ دەهات رادەبرد

٨. ئەوە خەجێ دەیکوت بابم، باپیرمت بە قوربانە

٩. ئەوە لە چ دەگەرێی سیامەندە گیانە؟

٢ (١٠)

١٠. دەیکوت ئەمن چەند مەلای دە زۆرزان، چەند کەیخودایان

١١. دەمناردەوە کن بابی تۆ، نەیدەدامێ

١٢. ئەمیش ئەوە بە تەقە سوارە روو دەکەمە سەری سیپانێ

١٣. هەڵدەستم لە خۆم حەرام دەکەم خزم و کەسانە

١٤. ئەوە خەجێ دەیکوت سیامەندە گیانە

١٥. دەوەندەم سەبرێ لێ بگرە تا ئەمنیش رووبکەمە تەویلە و ئێختەرخانێ

١٦. بێنمە دەرێ ئێسترێکی ماچەی لەوی دەکە قەلێ پانە

١٧. داگرم پاشۆکەیەکی بە وەزن سووکی بە قیمەت گرانە

١٨. ئەتۆ نازانی هەرجێیەکی ناڵی ئەسپی تۆی لێ بێ

١٩. ئەوە سەری خەجێ بابان وێرانە

٣ (١٥)

٢٠. بە جووتە سوارە، سوار دەبوون روویان دەکردە سەری سیپانێ

٢١. هەڵیاندەداوە، خێوەتێکی لەوی دەسەر بەژەنگاری چکۆڵووکانە

٢٢. ئەوە رۆژێکی لەوان رۆژان

٢٣. سیامەند هەڵدەستا لەکن نەدەما روح و هۆش، دوامەتی گیانە

٢٤. خەوی لێدەکەوت

٢٥. خەجێ ئەگە سەری هەڵدێنا تەماشای دەکردە سەری سیپانێ

٢٦. وەدەر دەکەوت گامێش بەکەڵی کێویانە

٢٧. تێیان دابوو کەڵێکی زەردی لەری دەبچکەلانە

٢٨. هەرچەند جارێ سمکوڵی دەکرد لە عەرزی
٢٩. تۆز دەباری، هەڵدەستا دەیگرت بەری عاسمانە
٣٠. هەر چەند جاری تەکانی دەدا لە خۆ
٣١. گامێش بەکەڵی دەگێراوە لە پێش کەڵە کێویانە
٣٢. خەجێ دەیکوت: دەرەبی کوێرىم
٣٣. ئەو کەڵەش یەکێکە وەکوو ئاموزا سیامەندم
٣٤. ئەمنی هەڵگرتووە[1] لە حەوت براو دوازدە ئاموزایانە

## ٤ (١١)

٣٥. ئەگەر بە گوێی سیامەندی رەسیدە دەبوو ئەوان قسان و شیوەن و گریانە
٣٦. سەری لە خەوێ شیرن هەڵێنا دەیگوت:
٣٧. ئامۆزا گیان خۆ ئەمن هیچ بە زۆریم نەهێناوی، هیچ بە پرچانم رانەکێشاوی
٣٨. ئەگەر گەلێ نارەحەتی هەتا بدنێرمەوە بۆ ماڵی دەبابانە
٣٩. دەیگوت ئامۆزا گیان خۆمن پێم ناخۆش نیە[2]
٤٠. تۆ تەماشا بکە سەری سیپانێ
٤١. وەدەر کەوتووە[3] گامێش بەکەڵی دەکەڵە کێویانە
٤٢. تێیاندایەکەڵێکی زەردی لەوی دەبچکەلانە
٤٣. ئەمیش غوربەیتم هەستا کوتم کوێرىم
٤٤. ئەو کەڵەش یەکێکە وەک ئامۆزا سیامەندی
٤٥. ئەمنی هەڵگرتووە[4] لە حەوت برا و دوازدە ئامۆزایانە

## ٥ (١٢)

٤٦. سیامەند دەیکوت ئامۆزا دا هەستە لە بۆم بێنە دەرێ
٤٧. تفەنگێکی لەوی دە چەخماخ خواری سەختی ئەلمانە
٤٨. خەجێ دەیکوت ئامۆزا سیامەند گیان
٤٩. لێی گەرێ لە راوی کەڵان وکەڵە کێویانە
٥٠. ئەوە بە مەسەلەی پیر و پێشینیان
٥١. مەیمەنەتیان چاک نیە[5] ئەوان سەگباب خێوانە

٥٢. سیامەند رقی هەڵدەستا بەوان قسانە

٥٣. دەیێناوە دەرێ تفەنگێکی چەخماخ خواری سەختی ئەلمانە

٥٤. جاسووسی دەگرت لە کەڵان، لە کەڵە کێوانە

٥٥. قامکی لە پەلەپیتکەی دەبزوات، دەدا لەکەلەکەی کەڵی زەردی بچکەڵانە

٥٦. هەڵیدەکێشا کێردێکی بیستوچوار پووڵەکە زەردی لەوی دەقەرە خۆراسانە

٥٧. رایدەکردە کەڵەکێوی بە غار و دوامەتی بە لینگدانە

٥٨. دەیناوە لەملی کەڵەکێویە دەرەبی ماڵە خێوی خەرابێ

٥٩ ـ ئەگەر پاشوێکی دەبەردی مەرمەڕەوە دەژەنی

٦٠ سیامەندی هەڵدەداشت بە سەر پەلی دە دارە بەنێ

٦١. خەجێ دەڵێ مەناڵە ئامۆزا سیامەند گیان مەناڵە

٦٢. هەر چەند تۆ دەناڵی، ناڵەت لە گیانم!

٦ (٩)

٦٣. سیامەند دەڵێ خۆ ئەمن لە بەر برینی خۆناناڵم

٦٤. لە بەر بێ کەسی و قەلەندەری تۆ دەناڵم

٦٥. ئەگەر خودا دابای بەختم دەگەڵ ئیقباڵم

٦٦. ئەمن دەبووم بە سەردار، ئەتۆش دەبوویەوە بە حەڵاڵم

٦٧. خەجێ دەیکوت:

٦٨. ئامۆزا سیامەند ئەمن چەندم پێکوتی، بە قسە و دامەتی بە زبانە

٦٩. کورە نەمکوت لێی گەرێ لەروای کەڵان و کەڵە کێویانە

٧٠. سیامەند دەڵێ ئامۆزا خەجێ ئەو قسانەی تۆ هیچ فایدەی نیە

٧١. هەچ موقەددەرێکی خودا ئیرادەی پێ بێ، رەدبوونەوەی نیە

٧ (٧)

٧٢. خەجێ دەڵێ وەێرۆ وەیرۆ

٧٣. وەی لەوێ دەردێ، وەی لەوێ ئەجەڵێ، وەی لەوێ نەکاوێ

٧٤. ئامۆزا ئەمن نەخۆشی خەڵکی دەبینم کەوتووە[6] بەجێ و سەنیر

٧٥. داوا دەکا لە میوە، لە میوەجاتێ، دوامیش لە بەفراوێ

٧٦. ئەتۆ دەبینم بە پەلی دە دارە بە نێوە

٧٧. لە جیات هەموو تەعامێکی
٧٨. قومان دەدەی لە گۆمیلکە گۆمیلکەی دەخوێناوێ!

٨ (٤)

٧٩. سیامەند دەڵێ: ئامۆزا ئەمن حەوت برینم دەبەدەنێ دان
٨٠. وەرە تابکەم حیسابی ئەوان برینانە
٨١. چواری لە بەر خاتری چاوەکاڵەکانی تۆ هیچ نین
٨٢. ئەمما سێیان کوترە باریکەیان تێدا سازکردۆتەوە هێلانە!

٩ (٥)

٨٣. خەجێ دەڵێ ئامۆزا گیان، ئاوی سەری سیپانێ دێتە خوارێ
٨٤. چەندی بە تاڵی بە توندی چەندی بە مەندی چەندی بەتیژی
٨٥. دەدا لە سومبلێ، گیابەندێ، خاوێ، لە گوڵە بەرۆنەی سەر بە گژنیژی
٨٦. شەرتە ئەمن پاشی تۆ دەڕۆم لەمەملەکەتان. دەگەرێم بە بێ کەسی
٨٧. هەتا مردنێ بە کیژی!

١٠ (٨)

٨٨. خەجێ ئەگە سەری هەڵدێنا بە شیوەن و دوامەتی بە گریانە
٨٩. تەماشای دەکردە سەری سیپانێ
٩٠. گەلی حەوت برا و دوازدە ئامۆزایانە
٩١. خەجێ لە کنی نەدەما هۆش و دوامەتی رووح و گیانە
٩٢. دەیکوت وەی لە سەری سیپانێ بە قووڕێ گیراو
٩٣. چەندی بە شاخە، چەندی بە ماهە، چەندی بە بەردەتاتە
٩٤. سیامەند ئامێزم لە بۆ بکرەوە
٩٥. خەجێشت لە بۆهات بە خەڵاتە

١١ (٥)

٩٦. خەجیش لەوێ شاخێ. لەوێ چرێ، لەوێ بەندەنێ
٩٧. نێوی خوا و رەسووانی بەیاد دێنا
٩٨. خۆی هەڵدە داشت بە سەر پەلی دە دارەبەنێ
٩٩. ئەوە دەڵێ مەناڵە گوێر غەریب مەناڵە

١٠٠. هەرچەندی تۆ دەناڵی ناڵەت لە گیانم[٧]

ئەم بەیتە لە یازدە بەند پێکهاتووە و سەرجەم، سەد دێڕی لە خۆ گرتووە. درێژترین بەند، بەندی پێنجەم بە هەڤدە دێڕ و کورت ترینیان، بەندی هەشتەم بە چوار دێرە. بە درێژایی یەکەکانی گێڕانەوەی ئەم دەقەدا، سێ هاوسەنگی و سێ ناهاوسەنگی وەبەرچاو دێ. کەواتە سێ زنجیرەی داستـــــــانی لەم دەقەدا، پێکەوەلکاون. ٦٠ دێڕی سەرەتای بەیت، سەر بە ئاڵقەی گێڕانەوەن. لەدێڕی ٦١ را هەتا دێڕی ٨٧ و هەروەها لەدوو دێڕی کۆتاییدا(١٠٠ و ٩٩) دەقی بەیت شین و رۆرۆ دادەگرێ. لە نێوان ئەم دووبەشەی رۆرۆدا واتە لە دێڕی ٨٨ هەتا دێڕی ٩٨، سەر لەنوێ گێڕانەوە دەست پێدەکاتەوە. کەواتە ئەم دەقە هەر بە تەنیا خاوەنی دو ئاڵقەی گێرانەوە رۆرۆیە و لە ئاڵقەی نزا بێبەرییە بەڵام هێندەك نوسخەی تری خەج و سیامەند، ئاڵقەی نزاش، بە شێوەی پێهەلگوتنی ئەویندارانە، لەخۆدەگرن:

سیامەند دەیگوت: ئامۆزا بەژنت بەمن بمێنێ بەدار خێوەتی رومیانێ

سینگت بە من بمێنێ بە بەفری سیکەرە و سەرخانێ[٨]

نموونەی رۆرۆ لەم نووسخەیەدا:

٧٢ خەجێ دەڵێ وەیرۆ وەیرۆ

٧٣ وەی لەوێ دەردێ. وەی لەوێ لەجەلێ، وەی لەوێ نەکاوێ

٨۶ (خەجێ دەڵێ: )

شەرتە ئەمن پاشی تۆ دەرۆم لە مەملەکەتان دەگەرێم بە بێکەسی

٨٧ هەتا مردنم بە کیژی

ئەم نوسخەیە، بەشی تەختیشی نیە، بەڵام تەواوی یەکەکانی گێڕانەوە بەدوایەك، تێیدا هاتوون و بۆ ئاگادار بوون لەچۆنیـــــــەتی رووداوەکان پشتبەستن بە سەرچاوەیەکی دەرەوەی دەق پێویست نیە. کەواتە بەم ئاکامە

دەگەین ئەم نوسخەیە لە بەیتی خەج و سیامەند، لە نێوان ئەو حەوت پێکهاتە دەسنیشان کراوە، دەچێتە خانەی بەیتەکانی دەستەی دووهەم، واتە خانەی بەیتەکانی مەیلە و تەواو عەیار. هەر بۆیەش مەنتیقی مەجازی بە سەردا زاڵە، هاوسەنگی و ناهاوسەنگی زنجیرەکانی گێڕانەوە، بەم شێوەیە دەسنیشان دەکرێن:

هاوسەنگی ۱

۱ ئەوە دەڵێن بابی سیامەند و بابی خەجێ برابوون

ناهاوسەنگی ۱

۳ رۆژێکی لەوان رۆژان، چەند مەلای زۆرزان، چەند کەیخودای دەچلزان

٤ دەیناردنە کن بابی خەجێ، نەیدەدانە

هاوسەنگی ۲

۲۰ بەجووتە سوارە سوار دەبوون روویان دەکردە سەری سیپانێ

۲۱ هەڵیاندەداوە خێوەتێکی لەوێ دەسەر بەژەنگاری چکۆڵووکانە

ناهاوسەنگی ۲

۵۹ ئەگەر پاشوێکی دەبەردی مەرمەڕەوە دەژەنێ

۶۰ سیامەندی هەڵدەداشت بە سەر پەلی دە دارەبەنێ

ناهاوسەنگی ۳

۸۸ خەجێ ئەگەر سەری هەڵدێنا، بە شیوەن و دوامەتی بەگریانە

۸۹ تەماشای دەکردە سەری سیپانێ

۹۰ گەلی حەوت براو دوازدە ئامۆزایانە

هاوسەنگی ۳ بە شێوەی تراژێدی و کۆتایی چیرۆک

۹۶ خەجێش لەوێ شاخێ لەوێ چرێ، لەوێ بەندەنێ

٩٧ نێوی خوا و رەسووڵانی بە یاد دێنا

٩٨ خۆی هەڵدەداشت بە سەر پەلی دەدارەبەنێ

لەم دەقەدا، ئەزمێکی فەزایی ئەوتۆ وەبەرچاو نایە. لەنێوان سێ جۆرە سەرواکانی بەیتی، دوو جۆریان، واتە سەروای ئاسایی و سەروای دەسکردی تێدا هاتووە.

نموونە بۆ سەروای ئاسایی :

١ ئەوە دەڵێن بابی سیامەند و بابی خەجێ برابوون

٢ هەر لە بەر خاتری سیامەندی لێک جودا بوون

نموونەی بۆ سەروای دەسکرد:

٨ ئەوە خەجێ دەیکوت بابم با پیرت بە قوربانە

٩ ئەوە لە چ دەگەرێی سیامەندە گیانە؟

لەو رێسا باسکراوانەی فەسڵی پێشوو، دەتوانین ئاماژە بەمانەی خوارەوە بکەین:

رێسای ١: درێژەی گوتە بە ریزکردنی دەستەواژان:

٦ دەیەناوە دەرێ، ئەسپێکی سم تەبەقی کلک لە سەر چووانە

٢١ هەڵیاندەداوە خێوەتێکی لەوی دەسەر بەژەنگاری چکۆڵووکانە

٨٤ چەندی بە تاڵی بە توندی چەندی بە مەندی چەندی بەتیژی

٨٥ دەدا لەسومبلێ، گیا بەندێ، خاوێ، لە گوڵە بەرۆنەی سەر بەگژنیژی

٩٤ چەندی بە شاخە، چەندی بە ماهە، چەندی بە بەردەتانە

رێسای ٢: درێژەی گوتە بە زیادە خستنە سەر

٢٣ سیامەند هەڵدەستا لەکنی نەدەما روح و هۆش، دوامەتی گیانە

٥٧ رایدەکردە کەڵە کێوی بە غار و دوامەتی بەلیتگدانە

٦٨ ئامۆزا سیامەند ئەمن چەندم پێ کوتی بە قسە و دوامەتی بەزبانە

٧٥ داوا دەکا لەمیوە، لەمیوە جاتێ، دوامیتی لە بەفراوێ

٨٨ خەجێ ئەگەر سەری هەڵدێنا بە شیوەن و دوامەتی بەگریانە

٩٩ خەجێ لەکنی نەدەما هۆش و دوامەتی رووح و گیانە

## ڕێسای ٩ : هێنانی کردار بەشێوەی ڕابردووی بەردەوام

٤ دەیناردنە کن بابی خەجێ نەیدەدانە

٥ هەڵدەستاوە رووی دەکردەوە تەویلە و لێختەر خانێ

٦ دەیەناوە دەرێ لەسپیکی سم تەبەلی کلک لە سەر چووانە

٧ بەبەر دەرکی ماڵە خەجێ رادەبرد...

٥٤ جاسووسی دەگرت لە کەلان، لە کەڵە کیوانە

٥٥ قامکی لە پەلەپیتکەی دەبزاوت دەدا لەکەلەکەی کەلی زەردی بچکەلانە

٥٦ هەلێدەکێشا کێردیکی بیست و چوار پووڵەکە زەردی لەوی دەقەرە خۆراسانە

٥٨ دەیناوە لەملی کەڵە کێویە..

(لە زۆریەك لەدێرەکانیتردا، ئەم ڕێسایە دەبیندرێ)

## ڕێسای ١٥ : هێنانی ناوەڵناوی ئاماژە بە شێوەی (ئەوان ـ ئەوێ)

٣ رۆژێکی لەوان رۆژان ...

٣٥ لەگەر بە گوێی سیامەندی رەسیدە دەبوو لەوان قسان و شیوەن و گریانە

٧٣ وەی لەوێ دەردێ، وەی لەوێ لەجەلێ، وەی لەوێ نەکاوێ

٨٠ وەرە تابکەم حیسابی لەوان برینانە.

## پەراوێزەکان:

١ ـ لە دەقی سەرچاوەدا، (هەلگرتو) نووسراوە

٢ ـ لە دەقی سەرچاوەدا (نێ) نووسراوە

٣ ـ لە دەقی سەرچاوەدا(وەدەرکەوتۆ) نووسراوە

٤ ـ لە دەقی سەرچاوەدا(هەلگرتو) نووسراوە

٥ ـ لە دەقی سەرچاوەدا (نێ) نووسراوە

٦ ـ لە دەقی سەرچاوەدا (کەوتۆ) نووسراوە

٧ ـ ئەحمەد بەحری ـ گەنجی سەربەمۆر ـ سلێمانی ـ پەخشی سەردەم ـ چاپی یەکەم ٢٠٠٠ ـ لل ٩ ـ ٣٢٦

٨ ـ هەمان سەرچاوە ـ ل ٣١٤